بسم الله الرحمن الرحيم

« ولا تتمنوا مافضل الله به بعضكم على بعض ۰ للرجال نصيب مما اكتسبوا وللنساء نصيب مما اكتسبن » ۰

سورة النساء ٣٢

# پێشەکی

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە کێشەی ئافرەت و ماف و پێویستیەکانی و کاروباری سەرشانی تا ئێستاش بەردەوامە زانا ماددی یەکان و پیاوە ڕامیاری یەکان و پسپۆرانی ئابووری پێی دەخولێنەوە هەریەکێ بەجۆرێ و هەوایێ پرۆگرام و پەیڕەو بۆ ئافرەت دائەنێن ...

زۆر کەسان بەسەر شانی ئافرەتدا بازیان داوە و بەمەرامی خۆیان گەیشتونە ... لەم ڕۆژانەدا کەجیهانی ئێمە بۆتە تۆپی دەستی ئۆردوگاکانی ڕۆژهەلات و ڕوژئاوا بەهەوەسی خۆیان یاری پێ دەکەن ... بەم جۆرە مەسەلەی ئافرەت یاری پێ دەکرێت لەلایەن ئەم ئۆردوگایانەوە ... هێرشی ناڕەوایانە دەبەنە سەر ڕێڕەوی ئیسلام گوایە ئاینی ئیسلام چاوپۆشی لە مەسەلەکانی ئافرت دەکات و هانی دەدەن کەوا لە ئیسلام بکشێتەوە جا بۆ ئەم مەرامە سەرو سیماو لەشی ئافرەت دەکەنە کەرەستەیەك بۆ دژایەتی ئیسلام جا ئێمەش دەمانەوی بەگشتی گیروگرفتەکانی ئافرەت ڕوون

بکەینەوەو چ ڕێرەوێك تائێستا مەسەلەی ئافرەتی زانستیانە خستۆتە ڕوو .. ئایا ڕێڕەوانی دژی ئیسلام تا ئێستا چیان بۆ ئافرەت کردووە ..؟.. لەوکانەی کە ئێمە لەو باوەڕە داین کەوا کشانەوەی **ئافرەت لەئیسلام شێوانی کۆمەڵ دەگەیەنێ .**

**١٩٨٣ ز - ١٤٠٤ ك**

علی صالح کریم.

# ئافرەت پێش پەیدا بوونی ئیسلام

پێش پەیدا بوونی ئیسلام •• ئافرەت چەوساوە ترین ئادەمیزاد بوو لە هەموو سووچێکی جیهاندا ••

١ ـ « خەلکی نیوە دوورگەی عەرەب » کەم ترین شت نزم ترین شت بە لایانەوە ئافرەت بوو ••• وەکو مەڕو ماڵات دەیان ژمارد لەکاتی میرات بەشکردندا ئافرەت هیچ شتێکی بەرنەدەکەوت بەلکو لەگەڵ کەلو پەلەکانی ناوماڵ بەسەر پیاوان دابەش دەکران •• ئەگەر هاتوو ئافرەتێك شووەکەی بمردایە کوڕەکەی جلێکی فرێ دەدایە سەرو ئەبوو بە مولکی ئەو بە هەوای خۆی چارە نووسی بۆدا ئەنا ••• لەبەر باوەڕ نەکردن بە داوێن پاکیان و لەترسی دەست بەسەرا گرتنیان لەشەڕو شۆڕدا هەرلەمنداڵی‌یەوە زیندەگۆڕیان دەکردن •• چەند بیان ویستایە ئەیان توانی ژن بهێنن ژماردنی لەسەر نەبوو •• هەرکاتێ بیانویستایە ئافرەتەکەیان لەناو بەرن ئەیان توانی بەکوشتن لەناوی بەرن یاخود لەبازار بیفرۆشن •

٢ ـ لە چین دا :•• لەکۆمەڵی چیندا شوێنێکی نزم و پڕلە شەرمەزاری هەبوو ••• یەکێ لە شاژنانی بەرزی چین لەنامەیەکی کۆندا کە بەم دواییە دۆزرایەوە تیایدا دەڵێ : ( ئێمەی ئافرەت لەنزم ترین شوێنی ڕەگەزی مرۆڤایەتی داین ••

پێویستە نابەجێ ترین کار پیشەمان بێت ) .. لە گۆرانی یەکانیان دا دەڵێن ( ئای لە بەختی ڕەشی ئافرەت لە جیهان دا شتێك نی یە لە ئافرەت کەم تر بێت . کوڕەکان لە بەردەرگا پاڵ کەوتوون و دەڵێی فریشتەن لە ئاسمانەوە هاتوون .. بەڵام کچەکان کەس بە بوونیان حەز ناکات هەر کاتێ گەورە دەبن دەبێ لە ژوورەکەیان بن و دەترسن سەیری ڕووی ( ئادەمیزاد بکەن .. هەرکاتێ لە ماڵەکەیان دوورکەوتنەوە کەس بۆیان ناگرێ )[1] .

٣ ـ « ئافرەتی هیندستان لەپێش ئیسلام »

لەداستانە خەیاڵیەکانی ( مانۆ )دا دەڵێت : ( کاتێ کە ئافرەت دروست بوو فەرمانی حەز بە سەرجێ یی و جوانی و داوێن پیسی و تووڕەیی و بێ ئابڕوویی و بەدڕەوشتی بەسەرا درا ئەمەش یاسایەکی نەگۆڕاوە )[2] .

هەروەها ( مانۆ ) لەیاسایەکی دا دەڵێت لەسەر هاوسەری بەوەفا پێویستە خزمەتی گەورەکەی بکات وەك لەبەردەمی خوابێت و .. هیچ شتێك نەکات کە ئازارێك بەمێردەکەی بگەیەنێت کاتێ ئافرەت گفت و گۆ لەگەڵ مێردەکەی دەکات دەبێ بڵێ گەورەم و

(١) ـ حضارة الصين : ول ديورانت .. گۆڕینی محمد بدران لاپەڕە : ٢٧٣ .

(٢) ـ تاريخ العالم : گوڕینی الادارة الثقافية بوزارة المعارف لاپەرە : ٣٩٤ .

هەندێ جار بەناوی خوا بانگی بکاتو چەند هەنگاوێك بەدوایەوەی بڕواتو پاشماوەی مێردەکەی بخوات )[1] •

٤ ـ « ئافرەت لەکۆمەڵی یۆنانی کۆن دا »

( مێژوو نووسەکانی هۆی لەناوچوونی شارستانیەتی یۆنان بە لەناو چوونی خێزانو پەیدا بوونی ئافرەتی بەڕەڵلا لەپێنووس دەدەن ••• لەیۆنانی کۆندا لەسەر دەمی زێڕینیا ئافرەت هیچ ڕۆڵێکی لەشارستانیەتو کۆمەڵدا نەبوو وەکو کەلو پەلێکی ناوماڵ لەناوچوار دیواری ماڵدا دەژیا تا هەرە ڕۆشنبیرەکانی یۆنان داوای دەرنەکەوتنی ئافرەتیان دەکرد )[2] •

بەجۆرێ سەیری ئافرەت دەکرا هەروەکو تەنها بۆ منداڵ بوون دا نرابێتو وەکو کارەکەرەکانی ناوماڵ سەیردەکرا بەچاوی ڕێزو پڕ لەخۆشەویستی سەیر نەدەکرا هەروەکو ( خەتیب ) • بەناوبانگەکەیان ( دیموستین ) دەڵێ :ـ ( ئێمە ئافرەتە لەش فرۆشەکانمان دەوێ بۆچێژ وەرگرتنو ئافرەتە دۆستەکانیش بۆئەوەی ئاگاداری تەندروستیمان بکەنو هاوسەرەکانیشمان بۆزانو

---

(١) ـ حضارة الهند : ول دیورانت گۆڕینی دەزگی نجیب محمود لاپەڕە : ١٧٩ •

(٢) ـ حیاة یونان : ول دیورانت گۆڕینی محمد بدران لاپەرە ١١٤ـ١١٧ •

منالی ڕاستەقینە )[١] •

٥ ـ ئافرەت لە کۆمەڵگای کۆنی ڕۆمەکان •••

لەسەردەمی کۆماری یەکەم کەشارستانیەتی ڕۆمەکان‌بوو سەرۆکی خێزان سەرۆکی ئاینی بوو کە دەسەلآتداری ڕامیاری‌و بەڕێوەبەری ئابووری بوو هەمووکارێك بەدەست ئەو بوو هەموو مافێکی هەبوو تەنها ئەو دەی توانی بکرێت‌و بفرۆشێت ـ بەلآم ئافرەت هیچ جۆرە مافێکی لەم کارانەدا نەبووو یاسا هیچ مافێك‌و خۆیەتیەکی پێ نەئەدا لە یاسا کەیان سێ‌کەس هیچ مافێکی مرۆفایەتیان نەبوو ئەمسی کە سەش ( منالّ و شێت و ئافرەت )[٢] بوون •

ئەو سامانەی لەگەلّ ئافرەت لەمالّی باوکیا دەگوێزرایەوە بۆمالّی مێردەکەی دەبوو بەهی مێردەکەی لەیاسای ڕۆمەکان جۆرە هاوسەرێك هەبوو کە پێیان دەگوت ( هاوسەری بەگەورەیی ) بەم پێیە ئافرەت دەکەوتە ژێر چەپۆکی گەورەیی مێردەکەی هەموو پەیوەندی‌یەکی بەکەس‌و کاری دەپچرا •• بەپێی دەسەلآتی پیاوەتی ئەی توانی دادگا بۆ ژنەکەی دا بنێت‌و خۆی چارە نووسی بۆ دابنێت و هەرکاتێ مێردەکەی بمردایە دەخرایە ژێر دەسەلآتی

---

(٢) ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو •

(٢) ـ مبادیء القانون الروماني •• د• مجمد عبدالمنعم بدر لاپەرە : ١٩٧ ، ٢٤١ •

کوڕەکانی[1] •

٦ ـ « ئافرەت لەلای جوولەکەکان »

جگە لەوەی کەوا جوولەکەکان ئاینێکی ئاسمانیان هەبوو بەڵام لەبەر گوێ نەدان بەئاینەکەیانو شوێن کەوتنی خووو نەریتی باوكو باپیرانیان هەمووکاتێك مافی کوڕ لەپێش مافی کچ بوو •• وەکو کوڕەکان میراتی دەست نەدەکەوتو کچەکانیان تەنها بۆ کارکردن دەویست •• هەر لەمناڵی یەوە باوکی دەی توانی بیفرۆشێت •

٧ ـ « ئافرەت لەلای مەسیحیەکان » ـ لەناو دیانە کان پیاوانی دێر (کنیسە) لەخۆیانەوە چارەنووسێکی ڕەشیان بۆ ئافرەتەکانیان دا دەنا داوا کەری یاسای خۆشەویستیو بەزەیی پیاهاتنەوە بەبێ ئەوەی ئاوڕێك لەیاساکانیان بدەنەوە بە ئافرە تەکانیان دەگوت ئافرەت دەبێ هەر لەناوی خۆیەوە شەرم بکات ئافرەت خەمو نەفرەتی هێنایە سەر زەوی دەبێ ئەم سزایە بدەنەوە هەروەکو ( مانۆ ) گووتی : ئافرەت دەزگەی دۆزەخەو هەموو لەشیان گوناهە هەندێکی تردەیان گوت : ( شەیتان دروستی کردوونو ئەبێ نەفرەتیان لێبکرێت چونکە دەبنە هۆی بەد ڕەوشتی ) یا دەیان گوت : ( زۆر جار شەیتان بەشێوەی ئافرەت دەردەکەوێ )[2] •

---

(١) ـ هەمان سەر چاوەی پێشوو لاپەرە ٢٢١ ، ٢٦٥ •

(٢) ـ تاریخ العالم : السرجون هامرتن : گۆڕینی الادارة الثقافیة بوزارة المعارف المصریة •

پیاوانی دێر ئەوەندە لە بوونی ئافرەت دوودڵ بوون تا لـە ناو خۆیان زۆر جار کۆئەبوونەوە لەیەکتریان دەپرسـی : ( ئایا بۆی ) هەیە ئافرەتیش وەك پیاو خـوا بپەرسـتێ ، ئایا ئافـرەت دەچێتـە بەهەشت .. ئایا ئافرەت لە پاش مردنیا گیـانی دەمێنێ‌و جارێکی‌تر زیندوو دەبێتەوە لە ڕۆژ ی هەڵسانەوە ( القیامـة ) یاخـود گیانیشـی لەگەل لەشیا کۆتایی پێ‌دێت ) .

٨ ـ ئافرەت‌و ئیسلام :.. ئیسلام بە هیچ جۆرێك ئافـرەت لەپیـاو جیاناکاتەوە لەدەسکەوتی مافەکانی‌دا :

أ ـ ئافرەت خوشکی پیاوە هەردوکیان لەدایك‌و باوکێکن ( یا ایها الناس انا خلقناكم من ذكـر وانثی وجعلنـاكم شـعوبا وقبائل لتعارفوا ، ان اكرمكم عند الله اتقاكم ، ان الله عليم خبـير ) . خوای گەورە بانگ هێشتنی گشتی دەکات بەووشەی (الناس) لەزمانەوانی‌دا بەمانای ووشەی تاکی هەموو مرۆڤایەتی دێت ، هەروەها پێغەمبەری مەزنمـان ئەفـەرموێ :ـ ( انما النسـاء شقائق الرجـال )[1] .

ب ـ لەڕێڕەوی ئیسلام دا ئافرەت وەکـو پیاو ئادەمیـزادە وەکـو یەزدان دەفەرموێ ( یا ایها الناس اتقوا ربكم الذی خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها ، وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذی تسـاءلون بـه الارحـام ان الله كـان عليـكم

(١) ـ الامام احمد وابو داود والترمذی دەی‌گێڕنەوە .

رقیبا )[1] •

لەم ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێ کەوا خوای گەورە وەکو یەك بەیەکسانی‌یەوە بانگی پیاوژن دەکات ( یا ایها الناس اتقوا ربکم ) بۆ خواپەرستی‌و پشت بەخوا بەستن •• بۆمان دەردەکەوێ کەوا خوای گەورە گیان‌و دەروونی پیاو دەگێڕێتەوە بۆ یەك سەرچاوە ( خلقکم من نفس واحدة ) لێرەوە بەپێی زمانەوانی ( النفس ) بە مانای گیان ( الروح ) دێت لەلایەکی ترەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە بۆمان دەردەخات کەوا ئافرەت ئەگەڕێتەوە یەك سەر چاوەی گیانی لەیەك دایك‌و باوکن ( وخلق منها زوجها ) دایك‌و باوك‌و ئەوە هەموویان یەکسانن‌و دەگەڕێنەوە یەك سەرچاوە •

## ئافرەت‌و خواپەرستی

ئەوەی کەوا ڕوونە دەبێ ئافرەت وەك‌و پیاو خوا بپەرستێ‌و هیچ جیاوازی‌یان لەنێوان دانی‌یە •• تەنها بەڕادەی خواپەرستی نەبێت •• هەروەها ئیسلام ئافرەتیش لە پیاو جیا ناکاتەوە کەدەبێ ئەویش خوا بپەرستێ ••• لێرەوە ئیسلام ئافرەت بەرزدەکاتەوە لەوبارەی کە تیای‌دا دەژیا لەناو ئایینەکانی ترەوە ••• هەروەها خوای گەورە کاتێ گفت‌وگۆ لەگەڵ ئادەم‌و حەوا ( سلاوی خوایان لە سەربێ ) دەکات لەبەهەشت بەیەکسانی بانگی کردن‌و

(١) ـ سورەتی النساء ـ ١ ـ

هەردوکیانی دەگرتەوە ( یا آدم اسکن انت وزوجك الجنة وکلا منها رغدا حیث شئتما ولاتقربا هذه الشجرة )[1] هەروەهـا کاتێ سـەر پێچیان لە بەڵێنی خوادا کرد خوای گەورە گوناهەکـەی خستـە سەر شانی هەردوکیان : ( ألم انهکما عن تلکما الشجرة ۰ ؟ ۰۰۰ )[2] ۰

ئافرەتیش وەکو پیاو لێپرسراوە بەرامبەر هەموو ئەوکارانـەی دەی هێنێتە ئەنجام خۆیان خاوەنی بـیرو ڕای خویانن سـەربەستی گشتیان هەیە لەهەموو کارێك‌و دەبێ خۆیان هەست بەلێ برسینەوە بکەن ـ

ئافرەت بەهـەر ڕێگایەك و جیـاواز لـە مێردەکـەی دەتوانێ ڕێی خواپەرستی‌و خەبات لەڕێگای ئیسـلام بگرێتەبەر : ( یاأیهـا النبی اذا جاءك المؤمنات یبایعنك علی الا یشرکن بالله شیئا ) تا ئەفەرموێ، ( فبایعهن واستغفر لهن الله ان الله غفور رحیـم )[3] ئافرەت و پیاو یەکسانن بەرامبەر پاداشت‌و سزا ، ئافرەتیـش وەکو پیاو لەچـاکەو خراپە سزای دەدرێت : ( ومن یعمل من الصالحات من ذکر وانثی وهو مؤمن ، فؤلئك یدخلون الجنة ولایظلمون نقیرا )[4] ، ( وعد الله المنافقین والمنافقات والکفار نار جهنم خالدین فیها هی حسبهم )[5]

---

(١) سورەی الاعراف : ١٩ ۰

(٢) ـ سورەی البقرة : ٢٢

(٣) ـ سورەتی الممتحنة : ٥

(٤) ـ سورەتی النساء : ١٢٤

(٥) ـ سورەتی التوبة : ٦٨

هەر لە پەیدا بوونی ئاینی ئیسلام ئافرەتەکانی نیوە دوورگەی عەرەب لە پەیرەو و ڕێڕەوی ئیسلام گەیشتن و ئەتوانم بڵێم ئافرەتەکان لەم کارە پێش دەستیان کردوەو لە زۆر پیاوان بە بڕوا تر بوون ..

خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر (د.خ) هەر لەگەل هاتنە خوارەوەی پەیام باوەڕی بەخوا هێناو پشتگیری پێغەمبەری خۆشەویستمانی کردو هەموو مال‌و سامانی خۆی‌لەم ڕێیەدا بەخش کرد .

( ئەسما )ی کچی ئەبوبەکر نمونەی بەرزی ئافرەتی مووسلمان بوو لە زۆر شوێنا یارمەتی پێغەمبەرو هاوڕێکانی دا مەردانە یارمەتی کۆچ کردنی پێغەمبەری‌دا لە مەککە بۆ مەدینە ـ زۆر لە ئافرەتان مێردەکانیان موسلمان دەکرد و تێ کۆشان بۆ بلاوکردنەوەی ڕێڕەوی ئیسلام ... لەم ئافرەتە دلێرانە ( شەیما )ی کچی حەلیمەی سەعدیەو خوشکە نەبەزو ئازاکەی ( عومەر کوڕی خەتاب )و شۆڕە سواری مەیدانی جەنگ ( خەولەی کچی ئەزوەر ) و هەزارانی تر .. هەر لە کوردستانی خۆمان دەیا ئافرەت لەسایەی ئیسلام پێگەیشتن و ناوبانگی ئازاو دلێریان دەنگی دایەوە لەمانە ( خانزاد و حەپسەخان و عەنبەرخان ) و چەندانی تر .. بەلێ ئەی خوشکی بەڕێز ئەم ئافرەتانە بۆ مێردو کەس‌و کاریان باوەڕیان بەئیسلام نەهێنا .. بەلکو ئەوان تێ‌کۆشان کە باوك‌و براو مێردەکانیان لەڕێی

خراپ لابدەن . یاخود دەزانی کە یەکەم شەهید لەڕێی ئیسلام ( سومەیە )ی خێزانی ( یاسر ) بوو کە پاڵەوانانە کۆڵی نەداو باوەڕی خۆی نەگۆڕیو دڵی دوشمنەکانی خستە لەرزینو بەرگەی هەموو ئێشو ئازارێکی گاورەکانی گرت تا گیانی پاکی لەدەستدا .

ئەی خوشکی بەڕێز دەبێ بزانین کەوا هەر لە بوونی (حەوا)وە تا ئێستا هیچ پەیڕەوێك وەك ئیسلام بایەخی بە ئافرەت نەداوە ...
بەڵام لەبەر تێ نەگەیشتنو هەواو دەروونی بێ بایەخ ڕێی ڕاست فەرامۆش کراوە .

سروشتی ڕەچاوکردنی ئیسلام بۆ ئادەمیزاد بەهیچ جۆرێك ڕێگە نادات کە پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی پەیوەندیێکی گیان لە بەر ( حیوان ) انە بێت ... ئادەمیزاد بوونەوەرێکی خاوەن‌هێزو تواناو مێشکێکی دوور بین‌و بیرقوڵە بۆیە دەتوانێ پەیوەندی نا ئینسانی ژن و مێردایەتی بگۆڕێت بۆ پەیوەندیێکی هەست دارو پڕ لە خۆشەویستی و زۆر بەرز تر لە پەیوەندیێکی ئاژەڵی .

زۆر بەرز و بەهێز تر لەوەی کە پەیوەندی ژن و مێردایەتی تەنها چێژو تامێکی ( حیوان )ی بێت .. ئافرەت بەشێکی هەرە گرنگی مرۆڤایەتی‌یەو خۆی دروست‌کەری مرۆڤایەتی‌یە ... ئافرەت بەتواناترین مرۆڤە بۆ پاراستنی ئەو لانەو بێشکەی کە مرۆڤایەتی لێ هاتە بوون .

باوەشی ئافرەت بەهێز ترین تەزووی موگناتیسە کە ئادەمیزاد بۆ دوا ڕۆژێکی پڕ لەخۆشی‌و کامەرانی دەکێشێت ... هەر لەم لەم باوەشە وە خوو و ڕەوشتی باش‌و چەوت پەروەردە دەکرێت‌و هەر لەم باوەشە پاڵەوانانی دوا ڕۆژی وولات پەروەردە دەکرێن ..

هەر لەم کاتەش‌دا ئەم باوەشە ڕەوشتی چەوت پەروەردە دەکات .. گەر دایکەکە کەمتەر خەمی کرد لە پەروەردەکردن ، باوەشی دایك خوێندنگایە خوێندکاری زیرەك و تەمەڵی لێ دەردەچێ ... جا هەزار سڵاو لەو دایکەی منداڵەکانی دوا ڕۆژی،

دەبنە ئەو دلێرانەی سەرکەوتن و بیرو باوەڕی پیرۆز لەسەر پۆپەی ژیان بەرزدەکەنەوە ...

## یاسای هاوسەرێتی

بەیوەندی هاوسەرێتی ئامرازێکە بۆ ڕاژەی مرۆڤایەتی بۆ بنیات نانی ئادەمیزاد .. ئەم پەیوەندییە ( ئەرك )ە .. ئەرکی سەرشانە نەوەك تەنها بۆ چێژی چەند کەسانە بێت و لەپاشان هەر کەسە بەلایەکدا بڕوات ... ئەم پەیوەندییە دوا ڕۆژی مرۆڤایەتی دیار دەکات .. ئەم پەیوەندییە تەنها لەلایەن ئیسلامەوە نرخ و کێشی بۆ دانراوە لاپەڕەیەکی سپی بۆ هەڵدرایەوە و بەشتێکی پیرۆز ژمێررا ... لەوکاتەی گەلانی تر ئەم پەیوەندییەیان بۆ کات و ڕابواردنی چەند سائە بوو ... بەلام ئیسلام ئەم چێژە بە قێلێك دادەنێت بۆ بەجێ هێنانی ئەم ئەرکە پیرۆزە ...

لەگەڵ ڕەچاو کردنی نێرینە و مێینە لەئافرەت و پیاو لە جیهانی ( ئادەمیزاد ) دا هەر یەکێ لەم دووانە خاوەنی خاسیەت و سیفاتێکی تایبەتین کەوا نواندنی نگەتیڤ و پۆزەتیڤ دەکەن لە جیهانی ( ئینسان ) دا .

لەم ئایەتە پیرۆزەی خـوارەوە دا بەرهـەمی یاسـای پیرۆزی هاوسەریتی مان بۆ دەردەخـات کە بریتیـە لە یاسایەکی گیـانی‌و کاریکی گرنگ دەکاتە سەر یێك هێنانی ژیانی دوا ڕۆژی خێزان :ـ

( لتسکنوا الیها ، وجعـل بینـکم مـودة ورحـمة ) ئەگـەر بەرهەمی بەیەك گەیشـتنی دوو لـەش وەچە ( النسل ) بێت ئـەوا بەرهـەمی بەیەك گەیشـتنی دوو ئادەمیـزاد ( خۆشـەویستی و میهرەبانی ) یە لە نێـوان یەکتـردا و بێ بەیـەك گەیشـتنی دوو ئادەمیزاد ، ( دوو لەش ) بەیەك ناگەن ، هەروەهاش خۆشەویستی و میهرەبانی پەیدا نابێت لە نێوانیان دا و بەتایبەتی وەچە پەیوەندیان بەهێز تر دەکات وەچە بەرهەمێکی هاوبەشە لەنێوان ئافرەت‌و پیاوەوە بە جۆرێك دەبینین ئەو میهرەبانی‌یەو خۆشەویستی‌یەی لەنێوان دوو هاوسەرا پەیدا دەبێت •• لەنێوان خزم و دۆستانی تردا نی‌یە •

ئەمەش یاسایەکی (ذات) ی یەو بەویستی خوا پەیدا دەبێت بۆ بەردەوام بوونی ڕەوتی کاروانی ئادەمیزاد ••• ئەم خۆشەویستی‌یە لەپەیدا بوونی کاری ( سکس ) ەوە نی‌یە وەکو ( پێشکەوتنخوازانی ئیمرو باسی لێوە دەکەن بەلکو ئەم خۆشەویستی‌یە دیاری خـوای گەورەیە بۆ ئادەمیزاد ••• چونکە حەزو چێژی کاری ( سکس ) تەنها بۆ ماوەیەکی کەمەو بە تووڕە بوونەوە دوایی دێـت •• ئاسۆی

هاوسەرێتی زۆر لەوە بەرز تـرە کەزانا ماددی یـەکان باسی لێـوە دەکەن ••• لە هەموو یاسـاکانی ژیان ئاسـۆی فراوان تـرە ••• دوورە لە حەز و چێژی ( سکس )ی یـەوە بۆیە خـوای گـەورە دەفەرموێ :ــ

[ ان في ذلك لآيات لقـوم يتفـكرون ] •

ئەم پەیوەندی یەی نێوان هاوسـەران بەپەیوەندی بـەرزی و جوانی گیانەوە دوای دێت ، هەر دوکیان یەکتـریان خۆش دەوێ بەبێ ئەوەی سەیری لایەنەکانی دەرەوەی یەکتر بکەن •••

یاسای هاوسـەرێتی لەلایـەن خوای مـیهرەبانەوە نەخشـەی پیرۆزی و بەرزی لێ دراوە ، پێویستە بەرهەمی هەبێ مەرجەکانی هیچ سوودێکی نابێت ئەم مەرجانەش لە یاسـای دایکێتیەوە باسـی لێوە دەکەین •

## یاسای دایکایەتی

بڕیار نامەی یاسای دایکایەتی :

پێویستە ئاگاداری ئەو یاسایە بین بە پێی خۆشەویستی دایك بۆ منالەکەی ••• دایکایەتی لە نێوان دایكو و منالەکەی هەروەکو هاوسەرێتی یە لە نێوان ئافرەت و پیـاوەکەیەتی هـەریەکێ لەمـانە کاری خۆی دەکاتو بەرهەمەکەی وە دەسـت دێنێ بەوێنـەیەکی

گیان پەروەرانە ...

تا ئێستا نازانین یاسای هاوسەرێتی دایکایەتی چۆن کار دەکات هەر یەکە لەمانە لەوپەڕەو و دەسکار و شاکارەکانی گیانن دوورن لە دەسکاری خۆرسکی کەوا بۆی هەیە کارەکانی خۆی ڕێك بکات بەشیکار کردن‌و پێوانی ماتماتیکی چاوە ڕوانکراو ...

مەبەستی خوای گەورە لە گیان لێرە هەموو دەسکاری و شاکارەکانی دڵی ئادەمیزادە وەکو دەفەرموێت . [ لهم قلوب لایفقهون بها ][1].

( ئەمانە خاوەن دڵێکن کە هیچ هەست و کارێکی پێ ناکەن ).
هەروها ... [ هو الذی انزل السکینة فی قلوب المؤمنین ][2] ، ئەم خوایە گەورەیە کەوا ئارام و هێمنی خستۆتە دڵی ئیمانداران [ سألقي في قلوب الذين كفروا الرعب ][3] ، وا ترس و شپرزەیی دەخەمە دڵێ ئەو کەسانەی چاو پۆشی لەو خێرو خۆشیە دەکەن کە خوا پێی داون و باوەڕ بە خوای خۆیان‌و پێغەمبەرو ڕۆژی

(١) الاعراف : ١٧٩

(٢) الفتح : ٤

(٣) الانفال : ١٢

دوایی ناکەن • [ ثم قست قلوبهم من بعد ذلك فهي كالحجارة ][1]
« دڵتان وەکو بەردە پڕە لە کینە و ڕق ••• »
[ والله يعلم مافي قلوبكم وكان الله عليما حليما ][2] •

دل جگە لە پارچە گۆشتێکی سوور هیچی ترنی‌یە ••• بەڵام خوای گەورە کردوویە بە چاوگەی هەست و نەست و هەڵچون •• ئەمە یەکێکە لە ڕاستیەکانی گیان کە هەستی پێ دەکەن ••• هەروەکو پێغەمبەر (ص) دەفەرموێ [ دڵی بەندەکان لە نێوانی پەنجەکانی خوای گەورەیە ][3] •

دایکایەتی لە پاش سك هەلگرتن و منال بوون و شیر پێدان یاسایەکی گیانی‌یە و کارێکە تایبەتە بە ئافرەت بۆ ئەوەی وەچەی دوا ڕۆژی پێ بگەیەنێ پێخۆری منال‌دان و شیر پێدان خوای گەورە بەم جۆرە ویستی کەوا بەرهەمێکی گیانی کە شایانی خوا پەرستی بێت •• بگەیەنێت بە ئادەمیزاد ئەمەش مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەگەیەنێت [ والله جعل لكم من انفسكم ازواجاً وجعل لكم من ازواجكم بنين وحفدة ورزقكم من الطيبات ] (٤) •

دایکایەتی بەرز ترین و پیرۆز ترین کارە لەلایەن خوای

---

(١) البقرة : ٧٤
(٢) الاحزاب : ٥١
(٣) ئەحمەد دەیگێڕێتەوە
(٤) النحل : ٧٢

گەورەوە ••• خوای گـەورە لـە پاش باســی پەرســتنی خۆی و سوپاس کردنی بەندەکان بۆ ئەو ••• ئەوسا باسی ڕێز لێ نـان و بەرزی دایکی کردووە : [ وقضى ربك الا تعبدوا الا اياه وبالوالدين احسانا ، اما يبلغن عندك الكبر احـدهما او كلاهما ، فلا تقل لهمـا اف ولا تنهرهما • وقل لهما قولا كريما واخفض لهما جناح الذل من الرحمة ، وقل رب ارحمهما كما ربياني صـغيرا ][1] ئـەم ئایەتـە پیرۆزە ڕەفتاری جـوانمان نیشان دەدات لەگـەل دایك ••• دایك نمونەی بەرزی ئادەمیزادێکی نەبـەزو ڕەنـج کێشە ••• چـاکە و ڕەفتاری باش لەگەڵ دایك لە پاش خوا پەرستی دێت •••

هۆی ڕاستەقینە بۆ بوونی ئادەمیزاد دایکە و خـوای گەورە دایکی بەهۆی دیارو ســەرەکی بۆ ئەم بوونە دانـاوە : [ ووصـينا الانسان بوالديه ••• حملته امه وهنا على وهن وفصاله في عامين •• ان اشكر لى ولوالديك الي المصير ][2] خوای گـەورە داوامان لێ دەکـات کـەوا سوپاسی بکەین‌و هەروەها سوپاسی دایکمان بکەین شوکور بۆ دایك لە دوای شوکور بۆخـوای مـەزن هاتـووە ••• سوپاس بۆ خوا لەپلەی پەرستن دایە ( ئیمامی ڕازی )لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە دا دەفەرموێ : پەرستن تەنها بۆ خوایە بۆ کەســی ترنییە هەروەها ڕازە کردن لە پاش خوای گەورە بۆ دایك و باوکە ] •

---

(١) الاسراء : ٢٢ _ ٢٤

(٢) لقمان : ١٤

له ئیسلام دا هاوسەرێتی تەنها ڕێگایەك نی‌یە بۆ کۆبوونەوەی ئافـرەت‌و پیاو لـە پێخەفێك دا بەلکو لـە دوای ئـەم هاوسەرێتی‌یە پەیوەندێکی پتەوی گیانی هەیە هەروەکو لەپێشا باسمان کرد :

[ ومن آیاته ان خلق لکم من انفسکم ازواجا وجعل بینکم مودة ورحمـة ، ان فی ذلك لآیات لقوم یتفکـرون ] [1]... هەروەهـا دایکایەتی له ئیسلام‌دا تەنها منـاڵ بـوون نی‌یە بەلکو له دوای ئەم دایکایەتی‌یەکی گیان بەگیانی هەیە : [ والله جعل لکم من انفســکم ازواجا وجعــل لــکم من ازواجــکم بنیــن وحفـدة ورزقـکم من الطیبات ][2] .

## له نێوان یاسای هاوسەرێتی و یاسای دایکایەتی

یاسای دایکایەتی جیاوازی هەیە لەگەڵ یاسای هاوسەرێتی ..

یاســای هەوســەرێتی لــە ئافرەتێك و پیــاوێك پێك هــاتووە بەرهەمەکەیان لە دەروونی هەردوکیانەوە دەبێ ( وجعل بینکم مودة ورحمة ) . یاسای دایکایەتی لەیەك لایەوەیەو تایبەتە بە ئافرەت بە ئامادە بوونێکی گیانی تایبەت دەیکا بە چاوگەیەکی ســروشت کــە دەروونی مناڵەکان فێنك دەکاتەوە خوای گەورە وەچەی دوا ڕۆژی پێ دەبەخشێ ( وجعل لکم من ازواجکم بنین و « حفدة » ) .

(٢) النحل : ٧٢

# بەرهەمی یاسای دایکایەتی

بەرهەمی یاسای دایکایەتی بە هەموو جۆرێکیەوە بریتیە لـە ئادابی نەوە ، پیرۆزی ئەم یاسایە لەوەدایە کـە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی وەچەو دەبێتە هۆیەکی کاریگەر لە ژیاندا کاتێ هاوسەرەکان بە پەتێکی توندی کاریگەرەوە دەبەستێنەوە ٠

ژیان پڕ مانا ترو خۆشەویست‌تر دەبێ لە نێوانیان‌دا بەتایبەتی لەو کاتەی ( نەوەکان ) بە چاوێکی ڕێز لێنـان و خۆشەویستیەوە سەیری دایك و باوکیان دەکەن ٠٠٠ دایك و باوکیشی هەست بەوە دەکەن کەوا لە قاوغی خۆشەویستی خۆیان دەرچوون و بۆ کەسانی ترو خێر و خۆشی منالەکانیان کار دەکەن و ڕەنج دەکێشن ٠٠٠

ڕێز لێنان و خۆشەویستی منالەکان بەرامبەر بە دایك و باوکیان دەبێتە هۆی بـەرز بوونـەوەی ئادەمیـزاد و هاوکـاری ماددی و دەروونی لە نێوان یان دا ، لە ڕێڕەوەی ئیسـلام دا ڕێز نەگرتن و ڕق و کینە بەرامبەر دایك و باوکیان بە تاوانێك لە هەرە تاوانەکانی ئادەمیزاد دەژمێـرێت ٠٠٠ خـوای گەورە نایەوێ ئـەو ڕەنـج و کۆششەی دایك بە فیڕۆ بدات ٠٠ تا ئیسـلام لـەم یاسـایە دەری خستووە کە پایەی دایك لەمەش زیاتـرە ( بەهەشـت لە ژێر پێی دایکانە ) ٠٠ بەڵێ جا ئەوەی دەیەوێ بەرز بێتەوە لە جیهان داو لە پاشە ڕۆژیش ئەو بەهەشتەی خەوی پێوە دەبینێ وەدەستی بێنێ لەلای

دایکیەوە دەستی دەکەوێت •• لەپاش پەرستنی خوای گەورە لەکارە پیرۆزەکانی ئادەمیزاد ڕێز گرتنی دایك و باوکە ••

یاسای دایکایەتی یاسایەکی گیانی‌یە دەستی خـوای گەورەی تێدایە بەرهەم‌و بەرزی زۆر لەوەی باسمان کرد زیاترە •••

ئەوکۆمەڵگایەی چاکەو خۆشەویستی و جوان کـاری تیا بێ کارەکانی بەڕادەی پەرستن بەرز دەکاتەوە دەبێتە کۆمەلگایەك دوور دەبێ لە ڕق و کینە و چەوساوەیی و کۆیلیەتی ••• لەم گەردوونە ئادەمیزادێکی نوێ دروسـت دەکات کـە بەجوانتـرین شێوە پێی بوترێ ئادەمیـزاد دایـك زۆر لـەمە زیاتـرە کـە ( سـارتەر ) و دڵخوازەکەی باسی دەکەن :ـ ( پێویست ناکات ئادەمیزاد دایك و باوکی بناسێت •• ڕێزی بگرێت ) ••• بەڵێ بەلای ئەوەوە ئادەمیزاد هەرکە لە دایك بوو واباشـە پەیوەنـدی لەگـەڵ دایـك و باوکی ببڕێت ••• بەبێ ئەوەی هەست بە باری دەروونی منـاڵ‌و باشـە ڕۆژی مناڵ بکات هـەروەکو ئەم ( کابرایە ) بە درێژایی تەمەنی دایك و باوکی خۆی نەناسـیووە بەداخیشـەوە نـەوەکانی ئێمـە بەفەیلەسـوف ناوی دەنێن لەوکـاتەی تەنها جوولەکـەکان نـەبێ کەس حەز بە نووسینەکانی ناکات کە نیوە سەدەیەکی بە ( ماقول و ناماقول )ی بردە سەر ئەم ( کابرایـە ) درێژایی تەمـەنی لەگەڵ دڵخوازەکەی ( سیمون دی ریفوار ) بردە سەر بەبێ بەرهەم و •••

بەلکو ئەو ژیانەی تیای دا ژیان تەنها لە ژیانی ( بەراز ) ی دەکرد، لەو هەموو جوانی و خوشەویستی‌و میهرەبانیە دوور بوو کە هاوسەران تادوا ڕۆژی ژیانیا پێکەوە بەسراون‌و لە سەری سەریان دەنێنەوە •

ئەم

## بارەی کە دایکایەتی و هاوسەرایەتی تیای‌دا کاری خۆیان دەکەن

### یەکەم :ـ

یەکەم بە یەك گەیشتنی دوو هاوسەر دەبێ لە ڕێگایەکی پاك و ڕەوانەوە بێت کە خوای گەورە پیرۆزی دەکات‌و ئادەمیزاد تیای دا هەست بە بەرزی گیان و کەرامەتی و شەرەفی بکات لە دەربەدەری و بێ بەزەیی ( چێژ ویستەکان ) و بەدڕەوشتی بی پارێزێت ••• کە ئەمە هەستێکی ڕاستەقینە و ڕەوانە لە قاوغی یاسای هاوسەرێتی‌دا خۆی دەگرێتەوە لە جوانترین مەرجەکانی جولانەوەی ئەم یاسایە ئەوەیە کەوا ئادەمیزاد هەست بە یەك گەیشتن ( سکس ) ێکی وا بکات کەوا گیان و وێژدانی خۆی و خوای گەورەی لێ ڕازی بێت ••• کە ئەم جۆرە ڕازی بوونەش لە باوەش دوو هاوسەران کە بە ڕێگایەکی ڕاستەقینەوە بەیەکەوە بەسراون نەبێ دەست ناکەوێ جگە لەوەی کەوا ( کابوس سکس ) لەگەڵ کەسێکی

نەناسي و بێ گانە •• ئادەمیزاد دەبانە کۆمی زەلکاو و چڵپاوی تاوانەکانی شەرعیو کۆمەلایەتی کە هەموو کاتێك ویژدانی ئازاری دەدات •

هەروەها شتێکی سروشتیە کەوا ئەوشتەی یاسای هاوسەریتی بە تاڵ بکاتەوە •• یاسای دایکایەتیش بەتاڵ دەکاتەوە •• ئەو ئافرەت و پیاوەی لە ڕێگایەکی شەرعی و بە ئاگاداری چەند کەسانێکی باوەڕ پێکراو و هەردووخێزانەکە نەبێ ئەوهاوسەریەیە بەتاڵە و ئەو منانەی لە ئەنجامی ئەو بەیەك گەیشتنە ناپاکەوەبێ منالێکی ناپاکە ••• هەر چەندە ئەو منداڵە هیچ گوناهێکی نییە بەلکو تاوان لە ئەستۆی ئافرەت و پیاوەکەیە • هەر بۆیەش ئافرەت و پیاوەکە خۆیان بە خاوەنی ئەم منداڵە نازانن یا لە ترسی ئەو کۆمەلگایەی تیای دا ئەژین ( هیچ کۆمەڵێك ئەمە بەڕەوا نابینێت هەر چەند پلەی بەدڕەوشتی بەرزبێتەوە ) دەیدەنە پاڵ ( بەخێوگا )یەك ئەم منداڵە دەگرێتە ئەستۆی خۆی •• هەر وەکو خوای گەورە نمونەی دایکایەتی بەرز و پیرۆز بەم وێنەیە نیشان دەدات ئەو کاتەی کەوا ژنەکەی ( عیمران ) دەست لە کۆرپەکەی هەڵدەگرێت لە ئاسۆی پەیوەندی بەخوای گەورە کاتێ لە سکیا جوولە دەکات ڕوو لە خوای گەورەدەکات و دەڵێ : [رب اني نذرت لك مافي بطني محررا ، فتقبل مني انك انت السميع العليم ][1] ئەم کۆرپەیەش ( مەریەمی کچی

(١) ئال عیمران : ٣٥

عیمران ) بوو (د•خ) کە دایکی بۆ خوای خۆی وازی لە ویستی دایکێتی هێناو خوای گەورەش وەری گرت [ فتقبلها ربها بقبول حسن وانبتها نباتا حسنا ] •• بەم جۆرە مەریەم و کوڕەکەی کردە نمونەیەکی بەرزی ئادەمیزاد •

هەروەها خوای گەورە نمونەی نەوەی پیرۆز و بە بەرەکەتمان نیشان دەدات لەوکاتەی ( عیسا ) سەلامی خوای لەسەربێ دەفەرموێ : [ وبراً بوالدتي ولم يجعلني جبارا شقيا ][1] هەروەها دەفەرموێ : [ وجعلني مباركا اينما كنت •• واوصاني بالصلاة والزكاة مادمت حيا ][2] (عیسا) (د•خ) ئەم نەوە بە بەرەکەتە بوو کەوا هێرشی بردە سەر هەموو وێنەیەکی بەدپەرستی و خوانەناسی و بەدرەوشتی •• ڕەوشت و پایە و پاسایەکی خوایی بۆ ئادەمیزاد بەدی هێنا •

## دووەم :ـ

دەبێ پەیوەندیەکی ڕاستەقینە و بڕوا پێکراو بۆ هاوسەران بێتەکایەوە بە جۆری کەوا بەبێ ئەم پەیوەندیە سەر ناگرێت دەبێ حەزێکی پێویست و بەردەوام و سەرپەرشتیکی تەواو لە نێوانیان دا

(١) مریم : ٣٢

(٢) مریم ٣١

هەیێت کەوا ببێتە هۆی پەیدا بوونی بەرهەمێکی بەتام لە وەچەی دوا ڕۆژ •• جگە لە ئاڵ و گۆڕی هەست و بیر لە نیوانیـان دا کەببێتـە جێی ڕەزا مەندی هەر دوولا ••• دەبێ هەر دوولا بزانن کـەوا پێویستیان بە یەکتر هەیە و، تەواوکەری یەکتـرنو هیچ کامێکیـان بەبێ کـەرتەکـەی تـری بەرهـەمی تـەواو لە خێـرو خۆش بۆ خێزانەکەیان ناهێنێتە دی •• ئافرەت جێنشینگەو ئارامگای گیانـی پیاوەکەیەتی پیاوەکـەش ڕەنج کێش و بـە کـار و پیشە هـەڵسانی ئافرەتەکەیەتی ••• هـەر کارێکیـش بەبێ ئەوی‌تر بێ بناغـەیە و ناتوانێ کاروانی ژیان بباتە سەر ، هاوسـەران دەبێ هـەموو کاتێك ئەوە بزانن کەوا بەبێ یەکتر ژیان مانایەکی نی‌یە و ناتوانن هیـچ بەرهەمێك وەدەست بێنن • هـەردەم پێویـستیان بە یەکتر هـەیە و بەردەوامن لەو تێکۆشانە دەبێ بزانن ژیانیـان بەبێ ئەو ڕاسـتی‌یە تاڵە لە بەیەك گەیشتنێکی حەزو چێژ پەرستی لەکاری ( سـکس )دا هیچی تر نی‌یە ••!!

بەشی زۆری کاری پیاو لە دەرەوەیە بۆ پەیدا کردنی بژیـوی ڕۆژانەی و بەڕێوەبردنی خێزانەکەی •• لـە سەر ئافرەت پێویست دەبێ لەکاتی گەڕانەوەی مێـردەکەی ••• باوەشـی خۆی بکـاتە ئارامگایەك •• دەبێ ئەوە بزانێ کەوا هیـچ ئارامگـایەك لە باوەش ئافرەتەکەی گەرمتر نادۆزێتەوە •• هەروەها لەسـەر هـەردوکیان پێویستە بەرامبەر بە منداڵەکانیان ڕوو خۆش‌و دەم بە زەردە خەنەبن•

لەسەر پیاوەکەش پێویستە کۆڵ نەدات لە بەخێو کردنی خێزانەکەی بەرامبەر بەو رەنجەی ئافرەتەکـە لەماڵەوە دەی کێشـێت .. نابێ خێزانەکەی هیچ کاتێك هەست بە کەم تەرخەمی پیاوەکەی بکات .

هاوسەرێتی تەنها ئامـادەبوونێك نی‌یە بۆ کـاری ( سـکس ) دایکایەتیش تەنها ئامادە بوونێك نی‌یە بۆمناڵ بوون و بەخێو کردن بەلکو خوای گەورە تەنهـا لە بەیەك گەیشتنی پیـاوێك و ئافرەتێك پیرۆز ترین کاری ئادەمیزاد نیشان دەدات لە بەرهەمێکی دەروونی کەنابێ خۆرسك بێت وەکـو میهرەبانی و خۆشـەویستی لە نێـوان یەکتردا هەروەها دایکایەتی ( تایبەتیەکی گیانی‌یە )..

پەیوەنـدیەکی خوایی بەتین لە نێوان دایـك و باوك و مناڵەکانی پەیـدا دەکـات کـە جوانتـرین نمـونەی میـهرەبانی و خۆشەویستی نیشان دەدات . رێزی ئیسـلام بۆ خێزان لەوە دایـە کەوا خێزان جیهـازێکی کاریگـەرە بۆ پەرە پێـدانی مانای ژیـان ئاسۆیەکـی دەروونی دەبەخشێ بەو تاریکایی‌یە و ماددیەی تیـای‌دا دەژیت .

کە ئافرەتێك توانای مناڵبوونی نی‌یە دەبینین کـەوا توشی چ بارێکی پڕ لە ئازار دەبێت .

## سێیەم

دەبێ پەیوەندی هاوسەرێتی لە هەموو لایەك پیرۆزی چـوار

دەوری بدات کەوا لە چوار چێوەی پەیوەندی ئاسایی دەری بکات .
هاوسەرێتی کارێك نی‌یە بەتەنها بۆ پەیدا بوونی وەچە بەلکو ویستێکی خوایی‌یە بۆ بەرهەم هێنانێکی وا بەرز کەوا شایانی یاساکانی سروشت‌و زەمین بێ .. بەرهەم هێنانی خۆشەویستیەکی وا لە نێوان دوو هاوسەر کە لە دوای خۆشەویستی بەندە بۆ خوای گەورە دا ئەنرێت .

دەبێ وا بیر بکەنەوە کەوا جوانترین شت لە ئادەمیزاد ئادەمیزادیەکەیەتی کە هەموو ماناو جەوهەری بیروباوەڕو نمونەی بەرز و ئادگارەکانی دەروونی دەگرێتەوە .

جوانی گیانی و شێوازی لەشی دەشارێتەوە هەر یەکێك ئەوی تری بەلاوە جوان بێ دلگیر بێ ئەمە جوانترین نمونەی هاوسەرێتی‌یە ... یەکێ لەو نمونە بەرزانەی هاوسەرێتی .. ( هاوسەرێتی نێوان پێغەمبەرو ( خەدیجە )ی خێزانی بوو کەوا لەو کاتەی پێغەمبەر تەمەنی تازە لەبیست سال تێپەردەکرد ئەو کاتە خەدیجە تەمەنی چل‌سال دەبوو لەسەر ئەمەش خۆشەویست ترین خێزانی پێغەمبەر بوو .. تا لە پاش مردنی خەدیجەش هەموو جارێك باسی دەکرد .. بە جۆرێك تا خێزانەکانی لە پیا هەلدانی خەدیجەدلگیر دەبوون پێغەمبەری‌مەزن‌هەموو نهێنیەکانی‌لای‌خەدیجە بوو ..

جارێکیان پێغەمبەر بە خەدیجەی گوت : [ خەدیجە نازانم بۆچی وا نزیکە لە خـۆم دەترسم ] ئەمیش لە وەڵاما گـوتی : [ نـا .. خوای گەورە هیچ کات بۆ کەس مل کەچت ناکات .. چونـکە تۆ سەر لەکەس و کـارت دەدەی و ڕێزی میوان دەگـری و یارمەتی هەژارو لێقەوماو دەدەیت و هـەموو کات لەگەڵ ڕاسـتی دایت ] هەتاکو خەدیجە مابوو لە ژیان‌دا هیچ ژنێکی تری نەهێناو ئەو ساڵەی خەدیجەی تیا مرد ناوی نا ( ساڵی خەم و پەژارە ) .

بەڵێ جوانترین وێنەی ئیسلام لە ڕاسـتی هاوسـەرێتی پاك و بێ گەرد کە دەبێتە جوانترین نمونەی هاوسەرێتی و دایکایەتی لەم ئایەتە پیرۆزە دا :ـ

[ نساؤکم حـرث لکـم فأتوا حـرثکم انی شـئتم ، وقـدموا لانفسکم ، واتقوا الله ، واعلموا انکـم ملاقوه ، وبشر المؤمنین ][1].

## مافی دایك

ئیسلام ئاینی خۆشەویسـتی و چاکەیە ئاینی دادپـەروەری و سەر پەرشتی‌یە ... بە جوانترین شێوە ڕێزی دایکی دەرخستوە داوای مافی دایك و باوکی کردووە .. لە ڕوانگەی هەست بە چاکە کردن و پاداشتی چاکەوە .. نەوەك .. لە ڕوانگەی سۆز و پەیـدا کردنی دەنگ بۆ خۆی ...

---

(1) البقرة : ٢٢٣

دایك و باوك له هۆیه سەرەكیەكانی پەیدا بوونی ئادەمیزادن •

به هۆی دایك و باوك ئادەمیزاد هاته كۆڕی خەبات له پێناوی ناسینی خواو خواپەرستی ئەمانه بەگشتی و جگه له خۆ بەخت كردنی دایك و باوكو ئازارو ئەشكەنجەیان ••• دایك هۆیەكی دیار كراوه بۆ دەرخستنی ویستی خـوا ••• شـەرەفی جێگـای دایك و باوك لـه شەرەفی ( هۆیەتی )یه •• بۆ ڕاپەراندنی ویستی خوا ••• بـەلام ئادەمیزاد بۆ خۆشی خـواردن و خـواردنەوه و جـل و بەرگ و چێژی لەش نەهاتۆته جیهانـەوه ••بەلكو بۆ ناسینی خـواو بینینی هەموو ئەو جوانكاری‌یه و دڵگـری‌یه و دابین كردنی زانسـت و زانیاری و چۆنیەتی ژیانی هـەموو ئەو گیـانلەبەرانەی لـه دەوریا دەژین و ئەو كەرەسته خۆڕسكانەی لەهـەموو لایەكیەوه دەوریـان داوه له چیا بەرزەكـان و دەریـا پـان و بەرینەكـانی و ئەستێره گەشەكان و هەموو ئەو گیـانلەبەرانەی سـەرزەمین و ژێر دەریـا نیشانەی گەورەیی خـوا دەبەخشـن ••• دایـك و باوك بۆ بینینی دەستكاری و ئەو جوانكاری‌یەی خوای گەوره ئادەمیزادی هێناوەته بوون تا به هۆی ئەمانه خـوای گـەوره بدۆزێتەوه و بەدیـداری پەرستنی شاد بێت ••• له پاداشتی ئەم چاكەیەی دایك و باوك •• خوای گەوره دەفەرمووێ [ قل تعالوا اتل ماحـرم ربـكم علیكم الا تشركوا به شیئا وبالوالدین احسانا ] لەپاش شوكور و سوپاس بۆ خوای گەوره سوپاس و چاكه بۆ دایك و باوكەو ئەم سوپاسەش

بۆیان پێویسته [ ووصینا الانسان بوالدیه ... حملته امه وهنا علی وهن وفصاله فی عامین ان اشکر لی ولوالدیك ] .

خوای گەورە ڕێزێکی پڕ لـە بەرزی و پیرۆزی لـە دایك و باوك دەگرێت کە لەپاش ڕێز و پیرۆزی خۆی داینـاون .. ڕازە و ڕێزی دایك و باوکی بە پێویسـتی سـەرشانی نەوەکـانی داناوە و پاداشتی چاکەیان دەداتەوە بە دلگیر کردنیان تۆلەتان لێ‌دەسێنێتەوە . دایك و باوك لـەم ڕێزەوە هاوبەشـن دەبێ وەکو یـەك ڕێزیان لێ بگیرێت بەلام لەم دوو لایەنەی خوارەوە تەنها دایك دەگرێتەوە :

١ ـ هەلگرتنی منال نۆ مانگ لە سکیا و منال بوون و شیر پێ دانی بۆ ماوەی دوو سال کارێکە تایبەتە بە دایك : [ ووصینا الانسان بوالدیه ، حملته امه وهنا علی وهن وفصاله فی عامین ] ( فەخـری ڕازی ) دەلی : [ ( حملته امه ) بە ویستی خوا هاتە بوون‌و ( وفصاله فی عامین ) بە مانای لە دایك بـوون و هۆی مانەوەی بە ویسـتی خوا .. دایك مافی ڕازەیەکی وای هـەیە لە لایەن نەوەکـانی بە جۆرێ ، ئەم ڕازەیە بەشێکە لە بەشەکانی پەرستن ][1] .

٢ ـ هەروەکو لەپاسای دایکایەتی باسمان کرد کەوا منـال بوون ئامادە بوونێکی گیانی دەوێ کە تەنها دایك پێی هەلدەستی و خوای گەورە بۆ ئەم ئامادە بوونە دەفەرمووێ ، [ والله جعل لکـم

---

(١) موسلم و بخاری دەیگێرنەوە .

من انفسكم ازواجا ، وجعل لكم من ازواجكم بنين وحفده ] •

له پەیرەی ئیسلام دا دایك سێ پلەی له باوك زیاتره هەروەكو ئەو هورەیرە دەگێرێتەوە ، كـەوا پیاوێك هاتـه لای پێغەمبەر و پێی گووت : ( كێ لـه هـەموو كەس شـایانی ئەوەیە بیكەم به هاوڕێم و هاودەمم ) پێغەمبەر له وەڵاما فەرموی : ( دایكت ) پیاوەكه ووتی : كێی تر ئەم جارە فەرمووی دایكت پاشان باوكت[1] •

هەروەها دایك سێ پلەی چاكەی له باوك زیاتره بۆ منالەكانی•

چاكه كردن و ڕەفتاری جوان لەگەڵ دایك و باوك پیرۆزترین كاری ئادەمیزاده و به ئەركی سەرشان دەژمێررێت •

وەكو دەگێرنەوە كەوا پیاوێك هـاته لای پێغەمبـەر (ص) و ووتی ( من حەز به شـەڕ كـردن دەكەم لـه دژی گاورەكـاندا و ناشتوانم ) پێغەمبەر گوتی : ( دایكت و باوكت ماون ) كابرا ووتی : دایكم ماوە ، فەرمووی : ( چاكه لەگەڵ دایكت بكه دڵگیری مەكه به حەج و عەمرە و شەڕ له دژی گـاوردا هەیە )[2] جارێكی تر پیاوێك هاته لای پێغەمبەر و ووتی : ( حەز به جیهاد دەكەم و بۆم ناكرێ ) پێغەمبەر پێی فەرموو ، ( دایكت ماوە ؟ ) ، ووتی بـەڵێ

---

(١) موسلم و بخاری دەیگێرنەوە •

(٢) الطبرانی له ( الصغیر الاوسط بأسناد جید ) دەیگێرێتەوە

فەرمووی : ( بیگرە ... بەهەشت لە ژێر پێیەکانیەتی)[1] .

با چاوێك بە باری مێژوویی و جوگرافی و ئابووری و باوەڕ و یاسای ئیسلام بگێڕین بزانیـن ئایا ڕێگا دەدات کەوا ئافرەت لـە ژێر یاسای ئیسلامەتیدا کێشەی هەبێت ... یا هەندێ لە تیمە جەز بە چاو لێ کردنی ڕۆژ ئاوایییـەکان دەکەن و کێشـە بۆ ئافـرەت دەدۆزنەوە ..

شتێکی ئاساییە هەر کەسێك چ مرۆڤێکی ئیسلام یا نا ئیسلام گەر لەسەر پەیڕەوی ئیسلام دا نەڕوات هەزارەها کێشەی دەبێت ..

ئیسلام دەرمانی هەموو ژانێکی کۆمەڵە ئەوە شتێکی سـەلماوە ئیسلامەکان تا لەژێر ئالآی ئیسلام بوون قورئانی پیرۆز پێشڕەویان بوو هیچ کێشەیەك لە کۆمەڵ دا نەبوو بەڵام کاتێ پێشڕەوایەتی تریان بۆ خۆیان دۆزیەوە هەزارەها کێشـە و کۆسپ هاتە ڕێگا ، کێشەی ئافرەتیش یەکێکە لەم کێشانەی کە لە وازهێنانی پەیڕەوی ئیسـلام پەیدا بوو .. پێویست بە سەلماندن ناکات کە ئافرەتیـش وەکو پیاو هەر لە سەرەتاوە ئیسلامی ناسـیووە بـە ڕێڕەوێکی تایبـەتی خۆی دایناوە لە سەرەتای ئیسلامەوە بەشێکی زۆری مووسلمانەکان ئافرەت بوون و یەکەم ئادەمیزاد کە شەهید بوو لەم ڕێگەیە ئافرەت بوو .. ئافرەت لە ئیسلام دا گیانی یەکسانە لەگەڵ پیاو [یا أیها الناس اتقوا ربکم

---

(١) ابن ماجه و النسائی و الحاکم دەیگێڕنەوە .

الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء ][1] •

لەم ئایەتەدا یەکسانی ئافرەت و پیاو دەردەکەوێ هەردوکیان مافیان یەکسانە لە خوێن و نامووس و موڵك و ماڵ و شەرەف و سەربەرزی کە بە هیچ جۆرێك لە شەرەف و بەرزی پیاو کەمی ناکاتەوە : ( كل مسلم على المسلم حرام دمه وعرضه وماله )[2] هەروەها پاداشت لە دوا ڕۆژدا بۆ پیاو و ژن وەکو یەکە لەلایەن خواوە : ( فاستجاب لهم ربهم اني لا اضيع عمل عامل منكم من ذكر او انثى بعضكم من بعض )[3] ••• لە کۆمەڵگای ئیسلامدا ئافرەت مافی بوونی ماڵو سامان و کڕین و فرۆشتنی هەیە : [ للرجال نصيب مما ترك الوالدان والاقربون وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والاقربون ][4] هەروەها ( للرجال نصيب مما اكتسبوا وللنساء نصيب مما كتسبن )[5] لێرەوە نەختێك دەوەستین و سەیرێکی مافی ئافرەت دەکەین لە بارەی دەسکەوتی لە ماڵو سامان و

(١) النساء :- ١ -
(٢) شەیخان دەیگێرنەوە (موسلم وبخاری)
(٣) آل عيمران : ١٩٥
(٤) النساء : ٧
(٥) النساء : ٣٢

مامەلە کردن و سوود و قازانجدا کە تا ئەم نزیکانەش ڕۆژئاوای خاوەن شارستانیەت ئەم مافەی بە ئافرەت نەئەدا بۆ ئەوەی هیچ ڕێگایەکی نەبێت تەنها ئەوە نەبێ کە بە دەوری پیاوا خوول بخواتەوە جا ئەو پیاوە چ باوکی بێت و چ مێردی بێت چ سەرۆکی کارو پیشەی بێت ... بەڵێ ئافرەتی ڕوژئاوا زیاتر لە دوانزە سەدە پاش ئیسلام ئەم مافەی دەست نەکەوت کە ئیسلام پێی داوە و ئەگەر پێشی دابێت بەشێکی گرنگی لە بەرزی و شەرەف و ناموسی ڕامالیوە .

ئەو مافانەی دراوە بە ئافرەتی ڕۆژئاوا ئارەقەی نێوچاوان و بە خوێنی گەشی خۆی وەدەستی هێناوە ... بەلام ئیسلامی پیرۆز بەبێ خەباتی ئافرەت ، ویستەکانی زانیوە و مافەکانی پێ بەخشیوە . بەبێ ژێر دەستی بوونی باری ئابووری و بەبێ بەربەرەکانی نێوان چینەکانی ئادەمیزاد بەلکو لە ڕاستی و دروستی و دادی خۆیەتی کە ئەمانەی بەخشیوە و بە جوانترین شێوەش لە جیهانی خەون و خەیاڵ بە پێچەوانەی ئەوانەی کە هەر بە خەون و خەیاڵ شت بە سەر خەلکا دەچەسپێنن .

هەندێ لە سەر لێشێواو و ماددیەکان سەر بەخۆی و بوونی ئادەمیزاد بە بوونی باری ئابووری دائەنێن دەڵێن :ـ

( بەبێ خاوەندارێتی ماڵ و سامان هەست بە بوونی ئافرەت

ناکرێ ج کاتێك بوو بە خاوەن ماڵ و سامان ئەوسا دەتوانین بە ئادەمیزادی دابنێین ) هەر چەندە ئێمە بوونی ئافرەت بە بوونی باری ئابووری ناژمێرین ، بەڵام لەگەڵیانین لەسەر ئەوەی کەوا باری ئابووری لە ڕووی باوەڕمانەوە کارێکی زۆر دەکاتە سەر دامەزراندن و بوونی هەست و نەست ..

لێرەوە دەبێ شانازی بە ئیسلام بکەین کە سەدان سال لەمە و بەر سەربەخۆیی ئابووری بە ئافرەت داوە و دەتواتی هەی بێت و بکڕێت و بفرۆشێت و سوود و قازانج بۆ خۆیەتی و بەهێز و بازووی خۆی کار بە ماڵەکەی بکات بەبێ ( جێگر ) ... ئیسلام هەر لە باری ئابووری‌یەوە سەربەستی بە ئافرەت نەداوە بەلکو لە مەسەلەی شووکردندا جوانترین سەربەخۆیی پێداوە کە ئەمەیە :ـ

لە پەیڕەوی ئیسلامدا ئافرەت بەبێ بڕیاری خۆی مارە ناکرێ تا بە ویستی خۆی نەبێ هەروەکو پێغەمبەری مەزن دەفەرمووێ :ـ [ لاتزوج الثیب حتی تستأمر ولاتزوج البکر حتی تستأذن واذنها صماتها ][1] .

زۆر لە کەسان دەڵێن : ئایا لەو بارە کۆمەلایەتی‌یە و ئابووریەی ئافرەت تیای دا دەژی ئەمەی بۆ دەچێتە سەر ...؟

ئێمەش لە وەڵاما دەڵێین ئەوەیە ڕێگاو پەیڕەوی پیروزی

(١) موسلم وبخاری دەیگێڕنەوە .

ئیسلام جا ئەگەر کەسانێك ئیمرۆ کاری پێناکەن ••• ئیسلام و یاساکەی هیچ تاوانێکیان نی یە بەلکو هەزارەها شەهیدی بۆ داوا کردن و بەڕێوەبردنی یاسا بە نرخەکەی داوە •

ئیسلام مافی فێربوون و خوێندنی بە ئافرەت داوە کە مافێکی گرنگی ئادەمیزادە بە هەموو چینەکانیەوە و شتێکی پێویستە لەمەش زیاتر •• کردنی بە بەندێك لە بەندەکانی باوەڕ بەخوای مەزن لەسەر ڕێگای ئیسلام ••• پێویستە شانازی بە ئیسلامی پیرۆز بکەین کە یەکەم ڕژێمە لە مێژوو کە ئافرەت بە بێ خوێندن فێربوون بە ئافرەتێکی ناتەواو دەژمێرێ وەکو پیاو بێ جیاوازی فێربوونی لە سەر ( واجب ) کرد •••

ئافرەتیش وەکو پیاو ئەقل و هۆش ی بەرز نابێتەوە بێ فێربوون و خوێندن ئەمە مافی ئادەمیزادە ، ئەو مافەی تا ئێستاش وولاتە ڕۆژئاواییەکان گەر لەبەر پێویستی کاروباری ڕۆژانە نەبێ ڕێگای ئافرەت نادەن بۆ خوێندن • زۆرەها نووسەری ئەم سەردەمە کە لەو کەسانەن ڕۆژ لە دوای رۆژ بە دوایی ئەوەن کە ئافرەتی ئێمەش وەکو ئافرەتە بەڕەڵاکانی ڕۆژئاوا ، دەستەمۆ بکەن یا جۆرە نووسینی بێ سوود بڵاو دەکەنەوە لە دژی ئیسلام تیای دا دەڵێن : ( ئیسلام ئافرەت بە ئادەمیزادی پلە دوو دادەنێت و جیاوازی لە نێوان ژن و پیاو دا دەکات و ••• ) چەند شتێکی تر •• لێرەدا

دەڵێین ئـەو کـەسەی نەختێـك شارەزایـی لە چـۆنیەتی بوون و هەست و ویستی ئافرەت و پیاو هەبێت دەزانێ جیاوازی لـە نێوان ئافرەت و پیاو هەیە لە زۆر شتدا ••• ئافرەت بە پیاو ناگات و لـە زۆر کاریشدا پیاو بە ئافـرەت ناگـات •• جـا پێش ئەوەی باسی جیاوازی نێـوان ئافرەت و پیـاو بکەین دەبـێ بگەڕێینەوە بۆ ڕاستی جەوهەری کێشەکە و چاوێك بە باری ( فسیولۆجی و سایکلۆجی ) ئادەمیزاد بخشێنین ئەوسا دێینە سەر بڕیاری ئیسلام ••

دەپرسین ئایا ؟ ئافرەت و پیاو یەك جنسن و یەك کار و فەرمان بۆ هەردووکیان دەلوێ ؟ ئایا هەردوکیان لە کـار و فەرمانی یەکتر شارەزایی تەواویان هەیە ؟

نابێ جیاوازی لە نێوان دوو کەسدا بکەین لە چۆنیەتی ژیاندا لە ناو کۆمەل ••• بەڵام کاتێ یەکێـك لە ئەوی تر باشـتر کارێك بزانێت ئەو ساتە جیاوازی دەکرێت •••

ئەوە جیاوازی لە نێوان کار و فەرمـانە نەوەك لە خـەوتن و نووستن و خـواردن ••• ئایـا ؟ بڕیارێکی شـێتانە نییە کاتێ لە کۆنگرەیەکی ئافرەتان داوا لە پیاو بکرێت بە کارو پیشەی ئافـرەت هەڵبسێ لە سك کردن و منالّ بوون و بە خێوکردنی و شیر پێدانی لەو کاتەی ئافرەت لەم کارەدا پسپورترین ئادەمیزادە ••• یا کارێکی شێتانە نییە کارێك بدەینـە دەسـت یەکێك کە هیـچ سـەری لێ

دەرناچیێ ... ئایا فەرمانێکی بایەلۆجی بەبێ ڕەخساندن و گونجانی دەروونی و لەش دەبێت ؟!

لەگەڵ پسپۆری ئافرەت لە بوون و بەخێو کردندا هەموو فەرمانێکی بایەلۆجی و فسیولوجی و سایکلۆجی لەگەل گونجاوە بۆ ئەوەی بتوانێ ڕوو بە ڕووی ئەم کارەساتە مەزن و گرنگە بوەستێت ئەو هەموو هەستە ناسك و کارە بەرزەی دایکایەتی دەی گرێتە خۆی ئەو هەموو ئارام و وورە بەرنەدان بەدرێژایی تێکۆشانی و ئەو ووردە کاری یەی لە چاودێری و گەیاندنی دایکدا بەبێ ڕێك کەوتنی ئەو باری دەروونی هۆڵمانی هەست و بیرەی لەگەل باری چۆنیەتی سیما و لەش بۆ ئامادە بوون و خۆگرتن بەرامبەر سك کردن و بە خێوکردنی منداڵ ... هەردوکیان تەواو کەری یەکترن گەریەکێ لەوی تر وون بێت ئەوا شتێکی سەیر و نەگونجا و ڕوو ئەدات .

ئەو نەرم نیانە لە سۆزدا و ئەو هەڵچوونە ناکاوی یە لە وێژداندا و ئەو شۆرشە بەهێزەی لە هەستدا کەلایەنی سۆزە نەوەك بیر سەرچاوەیەکی ئامادە و پڕ تاو بە خشاندنی بچوك ترین پەنجە وەکو تەلی کەمانێکی گشت دێتە لەنجە و ئاواز ...

ئەو هەموو شتانە گشتی لە پێویستەیەکانی دایکایەتی یە چونکە منداڵ زیاتر پێویستی بەلایەنی سۆزە نەوەك لایەنی بیرو بیر کاری یەی

بەرز دەبێتەوە و نزم دەبێتەوە و دێتە دەست و نایەتە بەردەست ..
بەڵکو پێویستی بەو سۆزەیـە کەبێ دوا کەوتن منـداڵ دەتوانێ بە
شێوەیەکی جوان لە باوەشی گەرمی دایکی وە دەستی بهێنێ ..

ئەمە هەمووی باری تەواوی ئافرەتە کـە بەجوانترین شێوە
کارە ڕاست و دروستەکەی خۆی تەواو دەکات .

هەروەکو چۆن پیاو بە جوانی کارە راسـت و دروسـتەکەی
خۆی تەواو دەکات ... پێویستە لـە سـەری هەوڵدان لە دەرەوە
ڕوو بـە ڕووی دێـو و درنـج لـە دارسـتانەکان تـا ڕوو بـە
ڕووی ئاڵۆزترین ئامێری کارگەکان و هەموو هێزێکی سروشت لە
ئاسمان و زەویدا بۆ پارێزگاری خۆی و منداڵەکانی .. ئەم کارەی
پیاو پێویستی بە سۆز نییە و یارمـەتی نادات بۆ جێبەجێ کردنی
کار و پیشەی چونکە سۆز هەر ساتە لە گۆڕانە لە بارێکی پێچەوانە
بۆ بارێکی پێچوانە تر بە یەك لا ناڕوات تەنها ساتێکی کەم نەبێت...
سۆز بۆ کارو نەخشەیەکی کێشـراو بۆ مـاوەیەکی درێژ خـایەن
دەست نادات .. تەنها بیر نەبێت چونکە بیر نابێ هەر زوو بە زوو
لە بارێکـەوە بۆ بارێك بگۆڕیت بەڵـکو پێویسـتی بە دوور بینی و
ئەنجام و ڕێك خستنی باشترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە ئەنجـام جا چ
دروست کردنی ئاڵەتێك چ دانانی نەخشەیەکی ئابووری یا ڕامیاری
یا شەڕ و شۆڕ یا گێڕانەوەی ئاشتی بێت ئەمانە هەموویان پێویستیان

بە بیرە ••• سۆز ئەم شتانە دەشێوێنێ و تێکی دەدات ••• پیاو بەشێکی زۆر لە لایەنەکانی ژیانی دەبەخشێ بەو کارەی لە سەرپەتی و مال و منداڵی بێ دەژێنێ •• بەڵام لە لایەنەکانی سۆزەوە وەکو منداڵێکە لەم لاوە بۆ ئەم لاپەیوەندێکی بێ سەر و شوێنە ••

ئافرەت زیاتر حەز لە کارێك دەکات کە پسپۆری لێ‌ی هەیە خووی دەداتێ و لایەنی دەروونی ئاسوودەیە وەکو کاری برین سازی وانە ووتنەوە و بەخێو کردنی منداڵ و کار کردن لە باخچەی ساوایان ••• لەم شتانە باشتر سەری دەردەچێ و ئاسوودە تره •• هەست و سۆزی ئافرەت هەموو کاتێك بۆ ئەم لایانە ڕادەکشێ کە بۆی دروست کراوە و بۆی دەگونجێ وەك گەڕان بە دوای هاوبەشی ژیانی و خێزانداری ••• تەنانەت کاتێ منداڵێکی ساوا لە باوەش دەگری شنەیەکی فێنك دڵ و دەروونی دەگەشێنێتەوە ••• لەگەڵ ئەوەشدا وا ناگەیەنێ کەوا ئافرەت و پیاو بەیەك ناگەن لە کار و پیشەدا ••• زۆر جاری وا هەیە ئافرەت دەبێ بە دادپەروەر یا دەبێ بە کۆڵ هەلگر یا بەشداری جەنگ دەکات و پاڵەوانێکی دلێری لێ دەردەچێ ••• هەروەها زۆر جاری واهەیە پیاو ئاشچیەکی باشی لێ دەردەچێ یا لە کاروباری ناو ماڵ بێ وێنەیە یا لەسەر پەرشتی منداڵان هیچ ئافرەتێك پێ‌ی ناگات و سۆزێکی تایبەتی هەیە کە لە سۆزی دایکایەتی دەچێ ئەمانە گشتیان تایبەتین •

لێرە پرسیارێ دەکەین : ئایا ئەو کارانەی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ ئەنجامی دەدات دەی حەسێنێتەوە ؟ یا خوو زیاتر تووشی ئەشکەنجەی دەکات •• کاتێ لە دەرەوە دەگەرێتەوە و کاروباری ناوماڵ و پەروەردەکردنی منداڵ خەریکی دەکات و کاری دەرەوە زیاتر دووری دەکات لە ماڵو خێزانەکەی و نزیکی دەکاتەوە لە دڵ پیس و چاو برسیانی لەشی ئافرەت •

## یاسایەکی تایبەتی بۆ ژیانی ژن و مێردایەتی

ژیانی ژن و مێردایەتی پێویستی بە یاسایەکی تایبەتی هەیە•• هیچ رژێمێك و یاسایەك ناتوانێ ژیانی تەواوی ئادەمیزاد بگرێتەوە گەر پێش هەموو شتێك چاوێك بە ژیانی ژن و مێردایەتی نەخشێنێت چونکە بناغەی بوونی ئادەمیزادە ••• گەر ژیانی ژن و مێردێك بە رێك و پێکی چووە سەر ئەوە پێویست بە چەسپاندنی هیچ یاسایەك ناكات خۆی بخاتە نێوانیانەوە •• چونکە ژیانی ژن و مێردایەتی سەرکەوتوو لە خۆشەویستیەکی گەرم پێك دێت لە نێوان دوو دڵەوە هەر چەندە گەر ئەو جۆرە ژیان بە سەر بردنە لە نێوان ئەم دوو دڵە لە هەندێك شت دژی یاسایەك بووەستێت بەڵام ئەم ژیانە بەبێ کۆسپ و کێشە رێگا بگرێتە بەر هیچ یاسایەك مافی

نی‌یه شتی چەوتیان بەسەرا بچەسپێنێ کەدەبێتە هۆی جیابوونەوەیان لەسەر یاسا پێویستە ڕاست و ڕاوان بێت و دادێکی تەواوی هەبێت و هیچ لایەنێك لە دەرگای ژن‌و مێردایەتی ژێر نەخات بۆ یەکێکی تر ...

لەگەڵ ئەمەش هیچ یاسایەك ناتوانێ لە هەموو کاتێکدا بە تەواوی لە کێشەی ژن و مێردایەتی خۆی بسەپێنێ و هەموو لایەنێکی ئەم کێشەیە بگرێتە خۆی .

# با چاوێك بە یاسای ئیسلام بخشێنین

« لە ڕووی ئیلتزاماتی ژنەوە »

ئایا ئیلتزاماتێکی گران و پڕ کێشەیە ؟

ئایا ئەم ئیلتزاماتانە لەیەك لایەو بێ بەرامبەرەکەی ؟

ئایا ئەم ئیلتزاماتانە هەتا هەتایە و بۆی نی‌یە ئافرەت کاتێ کە ... دەیەوێ لە کۆڵی بێتەوە ؟

سێ شتی زۆر گرنگ لەسەر ئافرەت پێویستە بۆ بەڕێوەبردنی ژیانێکی خۆش :ـ

یەکەم :ـ ژن و پیاو بۆ ( سەرجێگا )یی دەبێ گوێ ڕایەڵی یەکتربن بە تایبەتی ئافرەتەکە هەرکاتێ مێردەکەی داوای لێکرد •

دووەم :ـ هیچ کەسێکی بێگانە نەیەتە ماڵ و جێگای مێردەکەی کە مێردەکەی حەز بەهاتنی ناکات •

سێیەم :ـ لە کاتی دیار نەبوونی مێردەکەی دەبێ ئاگاداری ماڵ و منداڵەکانی بێت و شتێ نەکات کە زیان بە خێزانەکەی بگات •

ئێستا بە درێژی لەم سێ ئیلتزامە دەکۆڵینەوە ...

ئیلتزامی یەکەم ، پێوێستی بە ڕاست گۆیی‌یەکی تەواو هەیە بۆ شێ‌کردنەوەی سروشتی لەشی پیاو وا دروست بووە کە هەرکاتێك ( شەحنەی جنسی ) بارگەی سکس کۆبۆوە پیویستی

به بەتاڵ کردن هەیە بۆ ئەوەی مێشك و بیری هەر بەم کێشەیە خەریك نەبێت و بشتوانێ کار بکات و بەرهەم وەدەست بێنێ٠٠٠بۆ ئەوەی ڕوو بە ڕووی کۆسپەکانی ژیان بێت ٠٠٠ ئادەمیزاد لەسەر دەمی گەنجایەتیدا باش ترین کاتە بۆ ڕەزای وولاتەکەی کار بکات و خەبات بکات بێ کۆڵنەدان ئا هەر لەم کاتەش هێزوو ووزەی جنسی لەو پەڕی بەهێزی دایە ٠٠ جا بۆ ئەوەی لایەك دوا نەخرێت دەبێ لایەك کپ بکرێت ٠٠ لەبەر ئەوەی کار کردن دەبێ بە بەردەوام بێت دەبێ لایەنی جنسی بە بەتاڵ کردن دەم کوت بکرێت وەختاو وەخت ٠٠

هەر چەندە ئافرەتیش هیچی کەمتر نییە لە پیاو بۆ ووزەی جنسی و خولانەوە بۆی بەڵام ئافرەت زیاتر حەز بە کۆبوونەوە دەکات ئەو کاتەی کە ماوەو دڵ و گیانی هاوکاری دەکەن ، نەوەك هەر بۆ تێر بوونی لەش ٠٠

ژنو مێردایەتی بچاوگەکەیەکە بۆ جێبەجێ کردنی ویستەکانی جنسی لە تەك پێویستیەکانی گیان و دەروون و پێویستیەکانی کۆمەلایەتی و ئابووری لە ئەنجامەکانی ئەم کۆبوونەوەیە ٠

کاتێ ئافرەت ڕێگای مێردەکەی نەدا کە پێویستی جنسی بەجێ بێنی ٠٠ ئەو ساتە مێردەکەی چی دەکا ؟ هیچ ڕێگایەکی نییە تەنها ئەوە نەبێ کە بچی لە دەرەوەی ماڵ لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانە

کـۆبێتەوە ... جـا ئایا ژنەکـەی خـۆی بـەمـە ڕازی دەبـێ ؟
جا بۆ پاراستنی خێزانەکـە لەگشت ناخۆشیەك لەنێوان ئافـرەت و
پیاوەکە دەبێ خێزانەکە گوێ ڕایەڵی مێردەکەی بێت تەنها لەو سێ
بارە نالەبارە نەبێت :ـ

یەکەم :ـ ئەگەر ژنەکە حەزی بـە مێردەکەی نەدەکـرد و
ناتوانێ لەگەڵیا کۆبێتەوە ..

دووەم :ـ ئەگەر هەر چەندە مێردەکەشـی خۆش بوێ بەڵام
حەزی بە کۆبوونەوە و گـەیشتن بـە پیاو نەدەکـرد .. ئـەمـە
نەخۆشیەکی سایکلۆجی چەوتە هەر چەندە زۆریشە .

سێیەم :ـ ئەگەر حەزی بە کۆبوونەوە کرد بەڵام داخـوازی
مێردەکەی بەجێ ناهێنێ .

با بێین ئەم سێ بارە نالەبارانە شـێ بکەینـەوە بزانین بەچی
دەگەین ...

باری یەکەم ، بارێکی تایبەتی نەگۆڕاوە بەیوەندی بە کاتێکی
دیار کراو نی یە ... لەبەر ئـەوە ناتوانرێ ئـەم بارە بگۆڕرێت بۆ
بارێکی باشتر ... لێرەدا پەیوەندی ژن و میردایەتی دەپچرێ و..
پێویستی بە جیابوونەوە هەیە جا بۆیە پێویستە ژن و پیاو پێش ئەوەی
ببن بە ژن و مێرد دەبێ بە دڵی یەك بن ..

باری دووەم ، ئەمەش هەر بارێکی نەگۆڕاوە و ناگۆڕێت ...

بەڵام پێویستی بە ڕێکەوتنێکی تەواو هەیە دەبێ هەر دوولا لە بیر و باوەڕی یەکتر بگەن ... یا دەبێ پیاوەکە داخوازیەکانی کپ بکات هەر چەندە ئازاریشی گرانە یا دەبێ ژنەکەی ئەو ئازارە هەڵگرێت هەر چەند گرانیشە و دەبێ داخـوازی مێردەکـەی بەجێ بهێنێ ، لەبەر ئـەوەی مێـردەکـــەی خۆی خۆش دەوێ و نایـەوێ لێی جیابێتەوە ..

گران نی‌یە ... زۆر جار مانـدوو بوون و سـەرگەردانی و بەکاری تایبەتی خەریك بوون دەبێتە هۆی ئـەم بارە وەختی‌یە ... بەڵام نەختێك بە ئامادەبوونی دەروونی و لەشی دەتوانرێ ئەم بارە لابەرێ پێغەمبەری مەزن داوای لە پیاوان دەکرد کەوا پێش جووت بوون لەگەڵ ژنەکانیان ( دەستەگەمە و وەرگرتن و بەخشین ) یان هەبێ لە نێوانیاندا بۆ ئەوەی ئەم پەیوەندی‌یە لە شێوەیەکی حیوانی بەرزتر بکـاتەوە لـە کۆبوونـەوەی دوو لـەش بۆ کۆبوونـەوەی دووگیان و لابردنی ئەم نەخۆشیە سایکلۆجی‌یە .

بەڵام کاتێ کـە ئافرەتەکـە پێویسـتی جنسـی هەبوو بەڵام مێردەکەی حەزی پێ نەدەکرد لەبەر خـەریك بوونێکی زۆر بـە کاروباری دەرەوە ( هەر چەندە ئەمە لە سـەردەمی لاویتی کەمە ) بەڵام گەر شتێکی وا ڕووی دا ئەوا یاسای ئیسلام لەگـەڵ ئەوەی

داوا له ئافرەت دەکات کەوا خۆی بگرێت و ئاگاداری باری دەروونی مێردەکەی بێت .. لەگەڵ ئەمەش بڕیار دەدا هەر کاتێ مێردەکەی بۆ ماوەیەکی زۆر وازی لێ هێنا ئەوا بۆی هەیە داوای مافی خۆی بکات لە ژن و مێردایەتی ئەگەر نرخی ئەوەش جیابوونەوە بووە .

ئیلتزامی دووەم :ـ ی ئافرەت بەرامبەر به پیاو ئەوەیە کە ژنەکە هیچ کەسێك نەیەتە ماڵ و جێگای مێردەکەی کە مێردەکەی حەز بە دیتنی ئەو کەسە ناکات ( مەرج نی‌یە ئەو کەسە بۆ کاری باش یا خراپ هاتبێ ) ... هەر کاتێ مێردەکەی داوای لێکرد کەوا کەسێکی دیار کراو نەیەتە ماڵەکەی و ژنەکەی به گوێی نەکرد ... چی ڕوو ئەدا ؟؟ ئەوە شتێکی دیارە کەوا ماڵەکە دەبێتە جێگای ئاژاوە شەڕە چەق و بەربەرەکانی نێوان ژن و مێردەکەی لەسەر کەسێکی بێگانە ... جا ئیلتزامی ژنەکە بۆ بەرژەوەندی کۆمپانیای نێوان ژن و مێردەکەیە کەوا لە جیاتی ئەوەی هەموو کات بە شەڕە چەق خەریك بن ئاگاداری منداله‌کانیان دەبن . ئەو شەڕە چەقەش لە دوا ڕۆژدا کار دەکاتە سەر مناڵەکانی‌و دەبێتە گرێیەکی دەروونی ... بۆی هەیە یەکێك بڵێ :ـ بۆچی یاسا داوا لە پیاو ناکات کەنەیەڵێ کەسێك بێتە ماڵەکەی کە ژنەکەی حەزی پێ ناکات ؟ لە وەڵاما دەڵێین :ـ **یاساکە بەرامبەر** ،

مێردەکەش هەمان دەوری هەیە •• بەڵام لە زۆرکاتدا هەڵچوون و تووڕەیی ئافرەت لە چاوگەیەکی بەجێوە نی یە ••• چونکە بۆی هەیە ئافرەت کاتێ ئافرەتێکی بێگانەی جوانکیلە دێتە ماڵەکەی یا لە دەرەوەی ماڵ هەڵس و کەوتێکی لەگەڵ مێردەکەیا دەبێ ••• ژنەکەی بێیەك و دوو دڵ گران دەبێ چونکە مێردەکەی خۆش دەوێ و نایەوێ لە دەستی بدات هەر چەندە مەرج نی یە مێردەکەی ئەمەی بە بیرابێت ••• زۆر جار لەسەر شتێکی پووچ یا بۆ ئەوەی بە هەموو کەرەستەیەکی مرۆڤایەتی مێردەکەی بۆ خۆی بێت ••• ژنەکە حەز بە هاتنی دایکی یا خوشکی مێردەکەی ناکات ••• یا کەسێکی تر ••• جا لەبەر چەوتی ئەم هەست و بیرە پێویستە ئەو کەسانە لە میوانداریتی قەدەغە نەکرێن ••• بەڵام زۆر جاریش وا دەبێ کە مێردەکەی بە هەڵە دادەچێ لە جۆری بیر کردنەوەکەیدا پیویستە بێتەوە سەر ڕێگا ••• بەڵام لە هەمووی گرنگ تر لە هەموو بارێکدا ، لە سەر ئافرەت پێویستە لە ماڵ و منال لە بەڕێوەبەرایەتی ماڵ کەم ـ تەرخەمی نەکات لە کاتی دیار نەبوونی مێردەکەی و لە کاتی دوور کەوتنەوەی لە ماڵ •• هەروەها ئەمە پیاویش دەگرێتەوە •

« ئەو بارە چەوتەی ئافرەت و پیاو تیایدا دەژین »

هەروەکو لە پێشا باسمان کرد لە هەموو کاتێك دا لە ناو

هەموو کۆمەڵگایەك دا هەر کاتێ خوو و ڕەوشتی ئافرەت کەوتە شێوان و ڕووی لە بەرەڵلایی کرد ... نەوەك تەنها خۆی لە دەست دەدا و پێوانەی خۆی تێك دەدا بەلکو پێوەر و سەر و سیمای هەموو کەسانی ترتێك دەچێ ، هەر لە منداڵەوە تا بەتەمەن ترین مرۆڤ و شارستانیەت ڕووی لە شێوان دەکات ... ئەمەش شتێکە مێژو و سەلماندوویەتی و لە پێشەوە باسمان کرد ووتمان پیاو شارستانیەت بنیات دەنێ بەڵام ئافرەت پیاوی دوا ڕۆژ بنیات دەنێ ... ئافرەت بەڕێوەبەری بەرزترین و پیرۆز ترین کۆمپانیایە گەر کەم تەرخەمی کرد ئەوا کۆمپانیاکە بێ سەر و شوێن دەبێت ...

بۆ ئەوەی منداڵەکانی تووشی گرێی دەروونی و لە پاشە ڕۆژدا پیاوی لاساریان لێ دەر نەچێ پێویستی بە دایکێك بە ئافرەتێك هەیە لە کاروپیشەی خۆیدا گورج و گۆڵ بێت و هەموو ژیانی خۆشەویستی بێت بەرامبەر ماڵ و خێزانەکەی ..

بۆ ئەوەی ئەو کۆمپانیایە تێك نەچێت کە ئادەمیزادی دوا ڕۆژی بێ دەست نیشان دەکرێت پێویستە پارێز گاری بەڕێوەبەرەکەی بکەین و لە ڕێگا دەرنەچێ ... کە ئەم بەڕێوەبەرەش ئافرەتە .. دایکە ، پێویستی بە یاسایەکی تایبەت هەیە بۆ ڕاست کردنەوە کە هەر کاتێ چەوت بوو ..

له سه‌ر مێرده‌كه‌ش پێویسته كه سه‌رۆكی گشتی ئه‌م كۆمپانیایه‌یه به‌م ڕاست كردنه‌وه هه‌ڵبسێت ••• خـوای گه‌وره ده‌فه‌رمـووی :
[ واللاتی تخافون نشـوزهن فعظوهن واهجـروهن في المضـاجع واضربوهن فأن اطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا ][1] •

له‌م ئایه‌ته پیرۆزه پلـه دوای پلـه باسـی چۆنیـه‌تی ڕاسـت كردنه‌وه‌ی ڕه‌وشته ناشیرینه‌كه‌ی ئافره‌ت ده‌كات •• تا ده‌گاته سه‌ر لێدان ، به‌ڵام لێدانێكی وا كه نه‌بێته هۆی بریندار بوونی یا مردنی•• وه‌كو هه‌ندێ كـه‌س به‌بێ ئـه‌وه‌ی به یاسـای ئیسـلام دا بڕوات یه‌كسه‌ر ده‌ی كوژێ وا ده‌زانن جارێكی تر نایه‌ته‌وه سـه‌ر ڕێگای ڕاست ، جا لێره ئێمه قسه له په‌یڕه‌وی ئیسلام ده‌كه‌ین به‌رامبه به‌م كاره ناسازه نه‌وه‌ك له‌سه‌ر ئه‌وانه‌ی له یاسای ئیسلام لایان داوه و به ناوی ئیسلامیش ده‌جوڵێنه‌وه •

هه‌موو ڕژێمێك له جیهان یاسایه‌كی تایبه‌تی هه‌یه بۆ ڕاسـت كردنه‌وه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی له یاسا ده‌رده‌چن •• ئیسلامی پیرۆزیش بۆ ئه‌و لاده‌رانه یاسای تایبه‌تی هـه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی بناغه‌ی خێزان نـه ڕوخێت نه‌بێته هۆی ڕوخانی هه‌موو شارستانیه‌ت ، كاتێ ئافره‌ته‌كه كارێكی نابه‌جێی لێ ڕوو ده‌دا پێویسته به پێی یاسای تایبه‌تی به‌م كاره چه‌وته ڕاست بكرێته‌وه نه‌وه‌ك له به‌یانی تا ئێواره له به‌رده‌می

(١) النسـاء : ٣٤

دادگابن و لەبەردەمی دادپەروەرێك هەموو نهێنیەكانی ژن و مێردایەتیان دەربخەن‌و ببێتە هۆی شلەژانی بنكەی یەكێك لە هەر دوكیان و ئەو جۆرە كردارە دەبێتە هۆی زیاتر دوور خستنەوەیان لە یەكتر .. لە سەر دادگا پێویستە .. لە هەموو كێشەكانی ژن و مێردایەتی و ناو ماڵ خۆی تێكەڵ نەكات لەسەر پیاو پێویستە بە گێڕانەوەی ژنەكەی بۆ سەر ڕێگا بەپێی فەرموودەی ئایەتە پیرۆزەكەی خوا پلە بە پلە .

پلەی یەكەم :ـ یەزدانی گەورە دەفەرموێ ( اللاتی تخافون نشوزهن ) یانی هەر كە ترستان لە دڵ پەیدا بوو و گومان تان لە ڕەوشتی ژنەكە كرد چونكە نەی فەرمووە ( ئەوانەی تاوانیان كردووە ) چونكە پێش ئەوەی ڕوو بدات دەبێ ئامادەی چارە سەر كردنی ببین .. چونكە دەردێك لە لەشی نەخۆشێك كە بە باشی جێگای خۆی گرت ئیتر چابوونەوەی گران دەبێت ... بەڵام گەر نەخۆشەكە لە سەرەتای دەردەكەی بوو و هێشتا تەشەنەی نەكرد بوو ئەوە چاك بوونەوەی زۆر گران نی‌یە ... لە پلەی یەكەم داوا دەكات كە بە قسەی خۆش و دڵ دانەوە و دەرخستنی كاری چاك و خراپ لە یەكتر ژنەكەی بگێڕێتەوە ...

بەڵام گەر ئەوە چارەی نەبوو دێینە سەر پلەی دووەم ئەم پلەیە لە پلەی یەكەم توند و تیژ ترە كە دەفەرمووێ : (واهجروهن فی المضاجع ) قول ترین ئاوڕدانەوەی سایكلۆجیەتە لە ئیسلامەوە

بۆ سروشتی ئافرەت •• کە ئافرەت زۆر بە جوانی و لەنجەولاری خۆیەوە دەنازێ •• زۆر جار ئەم جوانی‌یە دەبێتە هۆی ئـەوەی کەسانی تر بخاتە داوی خۆی و خۆشی لە یاسا دەربچێ••بەلام کاتێ مێردەکەی لە سەر جێگا پشتی تێ دەکات و گرنگی بـە جـوانی ژنەکەی نادات •• مل کەچ نەکردن بۆ ئەو هەموو ژنایەتی‌یەو جوانی‌یەی ژنەکـەی دەبێتە هـۆی شکاندنی لوت بەرزی و بەخۆ نازینی ژنەکەی ••• بۆی هەیە بگەڕێتەوە ••

بەلام گەر ئەمەش چارەی نەکـرد ئـەوسا دێینە سەر پلەی سێ‌یەم کە ئەم پلەیە لە پلەکەی تریش توند و تیژترە کە ( لێدان ) • لێدانێکی وا کە تەنها بۆ ئەقل پوون نەوەك بۆ ڤین رشتن بەسەریا و ئەم پلەیەش جۆرە شکاندنێکی هـەموو فیزو نازو خۆ بـە گـەورە زانینە کە ئافرەت پێ‌ی هەلدەسێ •• بەلام لەگەل ئەوەش ئەو پلەیە بۆ کاتی تایبەت نەبێ بە کار ناهێنرێ ••• زۆر باری سایکلوجی چەوت هەیە گەر بەلێدان نەبێ ڕەوان نابێ وەکو زانستی دەروون دەلێ لێدان بەکار ناهێنرێ تەنها بۆ ئەوکەسانە نەبێ کـە تووشی نەخۆشی سایکلوجی چەوت دەبن وەك نەخۆشی ( ماشۆشزم ) ئەو کەسەی تووشی دەبێ باری دەروونی باش نابێت تا ئازارێکی لـەشی پێ نەکات ئەو نەخۆشیەش تووشی ئافرەت دەبێ زیاتر لە پیاو بـە پێچەوانەی نەخۆشی ( سادزم ) کە پیاو زیاتر تووشی دەبن ••• ماشوشزم نەخۆشیەکە هـەر چەند ڕەفتـاری ناخۆش و ئـازاری

نەخۆشەکە بدەیت ئەو زیاتر چێژ وەردەگرێ ••• زۆر جاری واهەیە پیاوێك تووشی ماسوشزم دەبێ ژنەکەی تووشی سادزم دەبێ تا ژنەکەی ڕەفتاری توند و تیژی لەگەڵ نەکات چاك نابێت •• بەڵام گەر ژنەکەی نەخۆش نەبوو و ئاسایی بوو لێدان پێویست نی‌یە وەکو پێغەمبەری مەزن دەفەرموێ : ( لایجلد احدکم أمرأته جلد العیر ثم یجامعها فی آخر یوم )[1] •

کەسێ لە ژنەکەی نەدات و شەویش لە گەڵیا تێکەل بێت ••

بەڵام گەر کارێکی نابەجێ لە پیاوەکەی ڕوویدا ، ئەوە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ : ( وان امرأة خافت من بعلها نشوزاً او اعراضا فلا جناح علیهما ان یصلحا بینهما صلحا ، والصلح خیر )[2] لێرەدا پێویستە ئەم هەموو بارانەی لە پێشەوە باسمان کرد لە سەر پیاویش بسەپێ تەنها لێدان نەبێ چونکە لە یاسای ئیسلام قەدەغەیە ژن لە مێردی بدات بە هیچ جۆرێك چونکە هەر کاتێ ژن لە مێردەکەی خۆی دا ئەوە لێی دەبێتە شتێکی ئاسایی بە درێژایی ڕۆژانە ژنەکەی هەر جارێك توورە بوو ئەوە لە سەر شتی گەورە و بچوك مێردەکەی دارکاری دەکات و ماڵەکە دەبێتە ئاژاوە •• جگە لەوەی کە ئەو پیاوە ڕەمزی ڕێز و گەورەیی‌یە لە ماڵەوە هیچ ڕێزێکی لەلای منداڵەکانی نامێنێت •

---

(١) بخاری دەیگێڕێتەوە •

(٢) النساء : ١٢٨ •

له پێشەوە ووتمان ئیسلام یەکسانی ئافرەت و پیاو بە پێی دادپەروەری و پێوانەی ژیانی هەر دوولایان هەڵدە سەنگێنی ..
له هەموو مەسەلەیەکی ڕەفتار کردن لەگەل یەك ئەوە بە پێی دادپەروەری و حساب و مافی هەردوکیانە .. ئایا هیچ ئافرەتێك هەیە لە جیهان دا داوا بکات کە مێردەکەی دارکاری بکات و بە باشیش لەگەڵیا بژیت ؟ لەگەڵ ئەوەش یاسای ئیسلام ڕێگای ئافرەت دەدات کە لە مێردەکەی جیابێتەوە هەر کاتێ چیتر نەیتوانی بەرگەی ئازاری مێردەکەی بگرێت و مێردەکەی لە بەدکاری وازی نەهێنا .. لەو هەموو بارانە ( حالات ) ەدا کە لە پێشەوە باسمان کرد بۆمان دەرکەوت :ـ

١ ـ ئەو شتانەی لە سەر ئافرەت پێویستە بەرامبەر بە مێردەکەی لە هەمان کاتدا بەرامبەری هەیە لە لایەن مێردەکەی هەر چەندە هەندێ جار دەسەلاتی پیاو زیاترە لە ئافرەت ئەمەش سەیری بەرژەوەندی نێوانیان کراوە و جگەلەوەی لە هەموو دام و دەزگایەك لە جیهان دەبێ یەکێك خاوەنی دەسەڵاتی تەواو بێت بەسەر گشتدا بۆ جێبەجێ کردنی کاری ڕۆژانە ، ئەوە بۆ ئەوە نی‌یە کە ڕێزی ئافرەت کەم بێتەوە و لە پیاو بە کەمتر بزانرێت .

٢ ـ کەوا ئەو شتانەی پێویست بووە لە سەر ئافرەت بەرامبەر بە مێردەکەی شتێکی چەسپاو نی‌یە بەلکو بۆ بەرژەوەندی گشتی‌یە کە ئافرەتیش دەگرێتەوە .

٣ ـ له بەرامبەر دەسەلاتی پیاو ، ئافرەت مافی بەر پەرچ دانەوەی هەیە .. بڕیاری خۆی لە دەستی خۆی دایە هەر چەندە زۆرەها ئافرەتی ئێستا ئەمە نازانن .. ئافرەت هەر کاتێك زانی ناتوانێ لەگەڵ مێردەکەی بژیت و خۆشی ناوێت دەتوانێ لەم پیاوە جیابێتەوە هەر چەندە چەندەها جار دادگا ئەو یاسایە پشت گوێ دەخات و بۆ چەند جارە ئافرەتەکە دەگێرتەوە دۆزەخەکەی جاران .. ئافرەت ئەم مافەی هەیە بەڵام بەمەرجێ واز لەو کەل و پەلانە بهێنێ کە بە رێگای مێردەکەی پەیدای کردووە ئەوەش مەرجێکی ڕاست و ڕەوانە چونکە کاتێ پیاوەکە ژنەکەی بەڕەڵا دەکات هەموو ئەو شتانەی لە دەست دەدا کە لەو ژن هێنانەی پەیدای کردووە سەرەڕای لە دەست چوونی ژنەکەشی کام لا بێتە هۆی جیابوونەوە ئەوە دەبێ واز لە بەشی خۆی بهێنی لەو ماڵە .. بەڵام کاتێ مێردەکەی بەڕەڵلای کردو لێی جوێ بۆوە بەبێ هۆیەکی تایبەت کە بێتە هۆی ئەم کارە ئەوە یاسای ئیسلام لە کاتی جوێ بوونەوە یەخەی مێردەکەی دەگرێ داوای بەشی تەواوی ژنەکەی لێ دەکات لە ناوماڵدا و داوای بەخێو کردنی ژنەکەی دەکات تا مێردێکی تر دەکاتەوە گەر ڕەفتاری ئەو مێردە ڕەفتارێکی دڕەندانە بوو بێت لەگەڵ ژنەکەی ئەوە باشترین چەکی ئافرەتە بەرامبەر مێردەکەی هەر چەندە دادگاکان ڕاست و ڕەوان یاسای ئیسلام لەو کێشانە پشت گوێ دەخەن .

# بەرەللاکردن «الطلاق»

زۆر سەر گوزەشتەی پێشینان و لە ڕاستی ژیانی ڕۆژانەمان دا ... گوێمان لە زۆرەها دەردە سەری کوێرەوەری ژیان دەبێت بەهۆی بەرەللا کردنی ژنەوە لـە دەربەدەر بوونی ئافرەتەکـە و منداڵەکانی و سەر لێ شێوانی پیاوەکە .. جگە لە زۆرەها هـات و چۆی دادگاکان .. لە زۆر کاتدا یا لە زۆرترین وولاتانی ڕۆژئاوا دەبینین ئافرەتێك زۆر بە کامـەرانی و دڵخۆشی‌یەوە یـە کـار و باری ماڵ و مناڵەکانی هەڵئەسێت هەموو کاتێك خـەریکی بـەدی هێنانی بەختەوەری‌یە بۆ منداڵەکانی و بۆ مێردەکەی ... بـەڵام لە پڕێکا ڕوو بە ڕووی بڕوانامەی تەڵاق دان دەبێت کە لە جەنابی مێردەکەیەوە بە دەستی دەگات .. بۆچی ؟! ئایا تەنها لەبەر ئەوەیە مێردەکەی ئافرەتێکی جوانتری یا بە سامان تری دۆزی‌وەتەوە یـا حەز بە گۆڕان دەکات لە ژیانی‌دا ؟ ئەوە چـەکی وێـران کـردنی خێزانە بە دەست پیاو ... بەڵام ئایا چی‌بکەین بۆ ئەوەی ئافرەت لەو دەردە سەری‌یە ڕزگاری بێت .. ئایا تەڵاق نەهێلین ؟!.

دەبێ ئەوە بزانین ئەو دەردە سەری و کۆسپ و تەگەرەیەی دێتە ڕێی ژیان بە هۆی تەڵاق نەدان زۆر گران ترە لە تەڵاق دان ڕەنگە داوای بەستنی مافی پیاو بکەن بەسەر تەڵاق دا .. ئایا ئافرەت تەڵاقی دەکەوێ تەنها بە ئیشارەیەك لەلایەن پیاوەوە یا لە دادگادا

... لێرە بە درێژی وەڵامی ئەم پرسیارانە دەدەینەوە ... خوای گەورە ( تەڵاق دان ) بۆ دانانی سنوورێك بۆ ئەو بارە نا هەموارە و ناكۆكیەی نێوان ژن و مێرد داناوە .. بۆ ئەوەی لە هەر یەكێ لەم ژن و مێردەی نەیان توانی لە گەڵ یەك بژین .. پاش ماوەیەكی زۆر لە ناخۆش و ناكۆكی‌ەشتێكی ڕەوانی‌یە كە ئەم دوانە لەو بارە ناخۆشە تا دوا هەناسە لەگەڵ یەك بژین بەلكو دەتوانن بەخۆش و كامەرانی لە یەك جیابنەوە ..

ئیسلام بەستنی پەیوەندی نێوان ژن و مێرد بە پەیوەندیێكی هەتا هەتایە دادەنێت و بۆ كاتێكی وەختی نی‌یە .. بەڵكو تا مردنە .. بەڵام ئەگەر هاتوو نەیان توانی لەگەڵ یەكتر ژیانێكی بەختیارانە بدەنە سەر و چەند هۆیەكی سەرەكی و تایبەتی هەبوو بۆ جیا بوونەوە .. ئەو جیا بوونەوە باشترە لەوەی بە شەڕ و شۆر لەگەڵ یەكتری بژین وە دەبێ ئەوە بزانین كە ئاینی ئیسلام بە هەموو ڕێڕەوەكانیەوە بە پەیوەندی ژن و مێردایەتی وەختی یانی بۆ ماوەیەكی كەم ڕازی نابێت و بە ناتەواوی لە پێنووسی دەدات .



## پەیڕەوی گشتی لە تەلاق

ئیسلام بۆ چارە سەر کردنی ناکۆکی نێوان ژن مێردان ئـەو ڕێگایانەی داناوە :ـ

١ ـ لە سەر ژن و مێرد پێویستە هەست بەلێ پرسینەوە بکەن بەرامبەر بە یەکتر و بەرامبەر بە منداڵەکانیان لـە بەردەم خـوای گەورەدا •

٢ ـ هەر کاتێ ناکۆکی کەوتە نێوانیان پێویستە ئارام بگرن و بە تایبەتی پیاوەکە کە دەبێ ئارامی زۆر بێت بەرامبەر ڕەفتاری • دڵ نەگرتووی ژنەکـەی وەکـو خـوای گـەورە دەفـەرمووێ ( وعاشروهن بالمعروف فأن كرهتموهن فعسى ان تكرهوا شيئا ويجعل الله فيه خيراً كثيرا ) •

٣ ـ هەر کاتێ زانرا کە ژن و پیاوەکـە زیاتر لەمـە ناتوانن لەگەڵ یەك ژیان بدەنە سەر پێویستە بۆ گەڕانەوەی باری هێمنی بۆ خێزانەکە ژن و مێردەکە سەر و نوێنەرێك لە کەس و کاری خۆیان بهێنن تا لە ناکۆکیەکانیان بکۆڵنەوە وەکو یەزدان دەفەرمووێ :ـ ( وان خفتم شقاق بينهما فأبعثوا حكما من أهله وحكما من اهلها ان يريدا اصلاحا يوفق الله بينهما )[١] •

٤ ـ ئەگەر ئەم (تەحکیم) لێ کۆڵینەوەی کەس و کارەکەیان سوودی نەبوو ئەوە بۆ جاری یەکەم ژنەکە تەلاقی دەکەوێت دەبێ

(١) النساء : ٣٥

لە ماڵی پیاوەکەی سێ مانگ بمێنێتەوە بە مەرجێ مێردەکەی نەچێتە لای ٠٠ تا لەو ماوەیە بەڵکو بگەڕێنەوە لای یەکتر ٠

٥ ـ ئەگەر گەڕانەوە لای یەکتر ، بەڵام دیسان ناکۆکی کەوتەوە ناویان ئەوە پیاوەکە تەڵاقی دەداتەوە هەروەکو جاری پێشوو بۆ ماوەی سێ مانگ ٠

٦ ـ ئەگەر ئەمجارە بە تەواوی نەگەڕانەوە لای یەکتر ئەوە بۆ جاری سێیەم پیاوەکەی تەڵاقی دایەوە ٠٠ ئەو تەڵاقە جارێکی تر ناگەڕێتەوە تەنها دەبێ ژنەکە شوو بە پیاوێکی تر بکات ئەگەر مێردی دووەم تەڵاقی دا گەر ژنەکەی پێی خۆش بوو ئەوسا دەگەڕێتەوە لای مێردی یەکەم ، ئەم ڕێگەیەش بە هیچ جۆر ناچێتە دڵی ژن و پیاوەکە کە لە بەردەمی شوو بە پیاوێکی تر بکات چونکە گەر ژنەکە حەزی کرد لای مێردی دووەم بمێنێتەوە ئەوە مێردە کۆنەکەی مافی بەسەرەوە نامێنی ٠٠ ئەم هەموو ئارام و لەسەر خۆیی‌یەی خوای گەورە دایناوە بۆ ئەوەی بەڵکو لەم ماوانەدا بگەنەوە یەکتر ٠٠ خوای گەورە تەڵاقی داناوە بۆ کاتی پێویست ئەگینا لەلای خوا حەلالێکی ناخۆشە (ابغض الحلال الى الله الطلاق)

## بۆچی تەڵاق بە دەست پیاوە ؟

هەر چەندە وەڵامی ئەم پرسیارە چەند لایەرەیەکی دەوێ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسە بەڵام بە کورتی دەڵێین :ـ

ئەگەر تەڵاق بە دەست ئافرەت بوایە بەم جۆرە هەر وەختێ ئافرەتەکە لە مێردەکەی تووڕە بوایە و پیاوێکی باشتـری دیبایـە چەکی تەڵاقی لە بەردەم مێردەکەی دەردەهێنا و مێردەکەی بەجێ دەهێشت و هیچ زیانێکی لێ نەدەکەوت ئەم مێردە تا یەکێکی تـر ئەم ماڵە ناماڵ و سامانێکیتر •• لەو کاتە مێردەکە سەرو ماڵی بـە فیڕ و دەچوو ئەو هەموو ماڵەی خـەرجی کـردبوو بۆ هێنانـی ژنەکەی هەمووی لەکیس دەچوو و مناڵەکانی دەر بە دەر ئەبوون و مارەیییەکـی زۆریشی لـە دەست دەدا •• لەوکاتـەدا ژنەکـەی پارەیەکی باشی لە مارەیییەکەی دەست دەکەوت ••

بەڵام پیاو کە تەڵاقی بەدەستە ئەم زیانە لە خۆی نادا ناتوانێ هەموو جارێك پارەیەکی زۆر خەرج بکات بۆ هێنانی ژنێکی تـرو دانانی ماڵیکی تر •• هەر چەندە لە ژنەکەشی تووڕە بێت ناتوانێ تەڵاقی بدات تەنها لەوکاتە نەبێ کە ژیان لە گەڵیا زۆر تاڵ دەبێت و ناتوانێ لەگەلی بژیت لەبەر چەند هۆی تایبەتی •• هەر چەندە تەڵاق بەدەست پیاوە بەڵام هەرکاتێ ژنەکەی زانی کە پیاوەکـەی مافـی دەخواو ژیانی تاڵ دەکات و ( خیانەت ) ی لەگەڵ دەکا لەوکاتەدا دەتوانێ داوای جیابوونەوەی لێ بکات و بەرەو دادگا بڕۆن •

## زیاتر له ژنێك ماره‌كردن « تعدد الزوجات »

زیاتر له ژنێك هێنان له‌پێش په‌یدا بوونی ئیسلام شتێكی ئاسایی بووه‌و به‌بێ ژماره ژنیان هێناوه و ... ئاینی ئیسلامی پیرۆز یه‌كه‌م ڕژێمه‌كه یاسا و سنوورێكی تایبه‌تی داناوه بۆ ژماره‌ی ژن هێنان .. له‌پێش ئیسلام ژماره‌ی ژن هێنان سنووری نه‌بوو له لایه‌ن ئه‌غریقیه‌كان و چینیه‌كان و هندی‌یه‌كان و بابلی و ئاشووری و میسریه‌كان .. هه‌روه‌كو شای ( لیكی ) چینی بڕیاری‌دا به ژماره‌ی ژنان تاده‌گاته (١٣٠) ژن هه‌روه‌ها یه‌كێك لـه شایه‌كانی چین لـه ته‌مه‌نی خۆی دا (٣٠ هه‌زار ) ئافره‌تی ماره كردووه .

ئاینی جووله‌كه‌كان بڕیاری له‌سه‌ر ماره‌كردنی ژن‌دا بـه‌بێ سنوور پێغه‌مبه‌ره‌كانی ته‌ورات هه‌موویان زیاتر له ژنێكیان لابووه له ته‌ورات باسی پێغه‌مبه‌ری خوا سلێمان كوڕی داود ده‌كا كـه‌وا حه‌وسه‌د ژنی ئازاد و سێ‌سه‌د جاریه‌ی هه‌بووه .

له ئاینی مه‌سیحی هیچ جۆره شتێكی ڕاست‌و ڕه‌وان نی‌یه كه زیاتر له یه‌ك ژن هێنان قه‌ده‌غه بكات .. ته‌نها ئه‌وه‌یه له نامه‌كانی ( بولس ما یفید ) دا ده‌ڵێ كه ده‌بێ قه‌شه زیاتر له ژنێـك مـاره نه‌كات ، ئه‌وه‌ی بۆ قه‌شه داناوه و بێ شك بۆ خه‌ڵكی تر زیاتر لـه ژنێك ڕه‌وا بووه له سه‌ر ووته‌ی ئه‌و . . مه‌سیحیه‌كـانی كۆن لـه هه‌موو كاتێـك زیاتر له‌ژنێكیان لابـووه وه‌كـو شـای ئێرله‌نـده

( دیارماسدت ) دوو ژن و دوو جاریەی هەبووە و ( شارلمان ) زیاتر لە ژنێکی هەبوو •• دوای ئەوە بەپێی بڕیاری قەشەکانی لۆنەری بڕیار درا کە شایەکان ( فیلیب ئوفاهیس ) و ( فـردریك ولیامـی دووەمـی بـڕوسی ) دەتـوانن دوو ژن مارەبکەن •• هـەروەها ( لۆثەر ) لە هەموو جێگایەك داوای دەکرد کە زیاتر لە ژنێك هێنان ڕەوایە •• ئایا ئیبراهیم پێغەمبەر ( د • خ ) نمونەی مەسیحیەکـی ڕاست گۆنەبووە کە دوو ژنی هەبوو •• لە ساڵی ( ١٦٥٠ ز ) پاش پەیمانی ئاشتی ( وسنفالیا ) پاش ئـەوەی ژمارەی دانشتوانی ئـەو وولاتە دەرکەوت بە هـۆی شەڕەکانـی سییەوە بڕیارێـك لـە ئەنجومەنی ( فەڕەنگەکان ) دەرچوو کـەهەموو کـەس دووژن بهێنێ ••

کاتێ کە دووژن لە ناو مەسیحیەکان قەدەغە بوو ئەگەر یەکێك ژنەکەی نەزۆك بوایە بە بڕیاری ژنی یەکەمی بەنمهێنی ژنێکی تـری مارەدەکرد بەمەرجێ ژنی یەکەمی بەرەللا نەکات و ببن بە دوو ژن ، مەسیحیەکانی ئەفەریقیای ڕەش لە هەموو کاتێك زیاتر لە دوو ژنیان هەبووە و تائێستاش •• کەنیسەش بڕیاری داوە •

لە ساڵی (١٩٤٨) کۆنگرەی لاوانی جیهـان لـە ( میونیـخ ) ی ئەلەمانیا بەسترا و هەندێك موسولمانانی وولاتانی عەرەبی بەشداریان تیا کرد •• یەکێك لە لێژنەکـان لە مەسەلـەی زۆر بوونی ئافـرەتی دەکۆڵیەوە لە ئەلەمانیا کە دوو ئەوەندەی پیاو بووت بەهۆی ڕوودانی

(جەنگەکانی جیهانی) .. جۆرەها شیکاریـان هێنـا بۆ ئەو مەسەلەیە بەڵام بێ سوود بوو تا موسوڵمانەکان داوایان لە لێژنەکە کرد کە بڕیار بدات کە هەر پیاوێك دوو ژن بهێنێ بەڵام ئەو داوایە پوچەڵ کرایەوە بۆ یەکەمجار پاشان لێیان بوو بەکێشەیەکی زل و شەڕەقسە ئەوسا دیسان بڕیاریان دا کەواهەر پیاوێك‌دەتوانێ دوو ژن بهێنێ و چارەیەکی تر نی‌یە . لە ساڵی ١٩٤٩ خەلکی (بۆن) پایتەختی ئەلەمانیای ڕۆژ ئاوا داوایان لە دەسەڵاتدارانی خۆیان کرد کە بڕیار بدەن کە هەر کەسێك دوو ژن بهێنی و ئافرەتە بێ لانەکان لە دەربەدەری ڕزگـار بکـەن ، یەکێك لە ڕۆژنامەکان ئەوەی نووسی بوو ... کەوا حکومەتی ئەڵمانیا داوای لە (جامع الازهر) کرد کەوا یاسای زیاتر لە ژنێك هێنان کـە ئاینی ئیسلام بڕیاری داوە بۆیانی بنێرێت چونکە ئەوانیش دەیانـەوێ سوودی لێوەرگرن بۆ خۆیان چـەند ویستێکـی تایبـەتی هـەیە بۆ ڕاگرتنی دوو ژن یا سێ ژن ئەو پێویستیانەش تا ڕادەیەك سوودێکـی یەکجار زۆری بووە و ئەو کۆمەڵانەی پێ‌هـەڵساون و سوودیـان لێ‌بینیوە لێرەوە ئەو پێویستیانە دەکەین بە دوو بە شەوە :ـ

یەکەم : ـ پێویستیەکانی کۆمەڵایەتی .

دووەم :ـ پێویستیەکانی کەسایەتی ( شخصی) .

یەکـەم :ـ پێویستیەکـانی زیاتر لـە ژنێـك ڕاگـرتن لە نێو کۆمەڵدا .. سوودێکی تایبەتی گشتی دەبەخشێ بە کۆمەڵ وەکو :ـ

گەر هاتوو ڕادەی ژن دوو ئەوەندەی پیاو بوو لەکاتی کەم بوونەوەی پیاوان بەهۆی شەڕو شوڕو نەخۆشیەکانی تایبەتی بە پیاو هەروەکو لە ئەورووپا ڕوی دا لە سالآنی دوایی شەڕەکانی جیهانی ، یەکێك لە پزیشکەکانی منالٚ بوون لە فلندا ( هلسنکی ) ئەلێ :-

لە هەر چوار منالٚ منالێك کوڕە ئەوانی تر کچن ..

لەو کاتەدا زیاتر لە ژنێك ڕاگرتن شتێکی ڕەوشتی و کۆمەلآیەتی‌یە زۆر لەوە باشترە ئافرەتانی بێ لانە لە کۆلآن و شەقامەکان پسوورێنەوە و جێگایەك نەبێت بەسەر بەرزی تیای بسرەون و کەسێك نەبێت ڕێزیان بگرێت و هەست‌و سۆزیان پێ بەخشێت چۆنکە دلٚ و گیانی ئافرەت لە باوەش پیاوێك کە پەیوەندێکی گیانی‌و دەروونی لە گەلٚیا نەبێ ناسرەوێ ..

ئایا چ کەسێك هەیە ڕێزی هێمنی‌و ئاشتی کۆمەلٚ بگرێت و حەز بە بەرەللایی ئافرەت بکات .. بەرەللایی ئافرەت بە ڕەللایی کۆمەلٚ بەرەللایی نەتەوەیە بە ڕەللایی‌و شلەژانی هەموو جیهانە .

ئەوەی لەوکات و بارەوە دژی ڕاگرتنی دوو ژن یا زیاتر بوەستێ کەسێکی لا سارو بەد ڕەوشتە و هیچ ڕێزی ئافرەتی لانی‌یە و حەز ئەکات قینە و حەزی گلآوی خۆی بەئاسانی و هەرزانی بە ئافرەتانی دەربەدەر و بێ لانە برێژێت و بێ ئەوەی هیچ بارێکی گران بکاتە مل‌و مشووری دوا ڕۆژی ئەم ئافرەتە و منالٚەکانی بخوات ئەیەوێ حەزی خۆی دابرێژێت بە نرخێکی کەم بێ ئەوەی شتێك لە دلٚ‌و

دەروونی بەخشێت باکیان بەو منالە ناڕاستەقینانە نی یە کە بە هـۆی ئەم کارە ناپاکە ئەکەوێتە کۆڵێ ئەم ئافرەتە یا لەکۆلانەکـان فـرێ ئـەدرێن ••

دوای پاش ماوەیەك بێلانە و ڕەوشت و بێ ئـەوەی دانـەیەك هەست و سۆزی دایکێتی بیر و هۆشی باوکێتی وە دەست هێنا بێت •

هەروەکو چۆن یەکێك لـە خانمەکانی ئینگلیز لـە ( ٢٠ ی ) نیسانی ١٩٠١ لە ڕۆژنامەی ( لندن تروثا ) دا نووسیبووی :ــ

( وا ژمارەی کچە بێلانەو دەربەدەرەکانمان زۆر بوون و دەردوو یەلا پەرەی سەند بێئەوەی کەسێ لەم دەردە بکوڵێتەوە •• من کە ئافرەتم هەرکاتێ چاوم بە یەکێکیان ئەکـەوێت غـەم و پـەژارە دام ئەگرێت و خۆزگە یەکێکی تریش بە شداری ئەم ئازارەی ئەکـردم کە چارەیەك بدۆزینەوە بۆ ئەم بارە نا لە بـارە ••• وە بەڕای مـن لە ڕای زانای بەناوبانگ ( تومس ) باشتر نی یە جوانتر نی یە کە ئەلێ پێویستە هەر پیاوێك کە تەنها ژنێکی هەیە ژنێکی تر بهێنێ ، بەم کارە کچەکانمان لەم بارە ڕزگاریان ئەبێت و ئەبن بە خانمی نـاو ماڵ و منداڵی دوا ڕۆژ پەروەردە ئەکەن ) هەروەکو کۆمەڵی ئافرەتانی ئەلەمانیا داوای کرد هەر پیاوێك ئافرەتێکی تر جگە لە ژنەکەی خۆی ڕاگـرێت •

دووەم :ــ پێویستیەکانی زیاتر لە ژنێك ی کەسایەتی :

أ ـ گەر هات و یەکێك ژنەکەی نەزۆك بوو ئەمیش حەز بـە منال نەدات و ئەمەشی شتێکی سەیر نی‌یە چوونکە حەز بە منال کردن حەزێکی دەروونی مرۆڤایەتی‌یە بۆ ئەمەش هیچ ڕێگایەکی‌نی یە تەنها کە ژنە نەزۆکەکەی بەرەڵا بکات و ژنێکی تر بهێنێ بە سەریا شتێکی ئاشکرایە ژنێکی‌تر لەسەری بهێنێ باشترە لـەوەی ژنە نەزۆکەکەی بەرەڵا بکات کە هیچ تاوانێکی نی‌یەو بۆ بەرژەوەندی ئەویشە •

ب ـ یا یەکێك ژنەکەی نەخۆش‌بێت بە نەخۆشیەکی وا کـە چاك بوونەوەی نەبێت و نەتوانێت بەکاری ژنایەتی هەڵسێت لێرە ئـەم پیاوە دوو ڕێگای هەیە :ـ

یا بەرەڵای بکات کە ئەمەش لە ڕەوشتی مرۆڤایەتی دانی‌یە کـە ئافرەتێکی‌نەخۆش بەرەڵا بکرێت و هەستی‌دەروونی‌شکێنرێت‌ڕێگای باشتر ئەوەیە ژنێکی‌تر بهێنێ و لەگەڵ بەخێو کردن و یارمەتی دانی‌و چارە سەرکردنی نەخۆشیەکەی ژنی یەکەم •

ج ـ گەر یەکێـك لەگـەڵ ژنەکـەی هـەموو کاتێـك هـەر لەشەڕ و شۆڕا بوون و ڕقیان لە یەکتر بوو لێرەدا واباشە یا بەرەڵای بکات و یابی هێڵێتەوە و ، ژنێکی‌تر لە سەریا بهێنێ ئەمەش ڕێگایەکی باشترە •

د ـ گەر یەکێك لـە بـەر کـارو بارەکـەی زۆر سەفـاری درێژ خایەنی دەکرد و لە بەینی دوو شارەکە لە هەر شارێك لەم دوو

شاره هەر جاره چەند مانگێك دەمایەوە ئەو پیاوەشی ناتوانێ هـەموو جارێك ماڵو منالەکەی لەم شارەوە بۆ ئەو شار بگوێزێتەوە جا ئەگەر ژنێکی تری هێنا لە شارەکەی‌تر لە ترسی ئەوەی نەوەك لەم شاره بـەد ڕەوشتی بکات و شەیتان بەسەریا زاڵ بێت و بە نهێنی لەگەل ئافرەتانی بەدڕەوشت ڕابوێرێت و منالی ناڕاستەقینەی لێ دوا کەوێ •

هـ :ـ بارێکـی تر مـاوە کـە پێویستـی بـەڕاست گـوێی و ڕەوانی هەیە ••• ئەمەشی ئەوەیە گەر یەکێك ووزەو هێزی جنسی زۆر بوو ژنەکەی لەبەر پیری یا نەخـۆشی کـەلکێکی وای نی‌یە و ساردی‌یەکی سێکس زۆر یەتینی هەیەو کاتێ مێردەکەی لە هەفتەیەکا چەند جارێك لەگەلیا کۆ ئەبێتەوە و ئەبێتە هۆی ئازار دانی ژنەکەیی و ئەگەر ژنەکەشی ڕێی نەدا ئەوە بۆی هەیە ئەم پیاوە بە نهێنی لەگەل ئافرەتێکی تـرا ڕابوێرێت ••• ئەمەشی ئەبێتە هـۆی بەد ڕەوشتی و ئاژاوەنانەوە لە خێزانەکەدا جا ئایا واباشتر نی‌یە بە دلی ژنـی یەکەم ژنێکی تر بهێنێت بۆی هەیە یەکێك بلێ باشە نابێ گەر ژنەکەی نەی توانی لەگەل مێردەکـە کـۆبێتەوە ••• کـابرا خۆی ڕاگـرێت و بەنهێنی شتی خراپ نەکـات و ژنی تری پێ ناوێ • منیشی ئەلێم ئایا چەند کەسە ئەوانەی ئەم جۆرە ئارامەیان هـەیە ؟ لەسەدا یـەك یاکەمتر ••• لە ڕۆژ هەلات چونکە جێگاو ڕێگای تێکەلاو بوونی ژن و پیاو کەمترە بەلام ئایا لە ڕۆژئاوادا کە لە هەموو جێگایەك پیـاو بـا ئافرەت ئەگات و ئەتوانێ لە گـەلیا تێ کـەلاو بێت ئەبـی ژمـارەی

ئەو کەسە بە ئارامانە چەند بن لەم شوێنە یەك لەسەد هەزار بە تایبەتی لەناو گەنجاندا • ئەبێ بزانین ڕێرەوی ئیسلام ڕێرەوێکی جیهانی‌یە جا چ لە ڕۆژهەلات یا ڕۆژئاوا ڕوو بە ڕووی بوونی ئەم جۆرە شتە شتێکی ئاسان نی‌یە ••• بۆی هەیە یەکێك پرسیارێ بکاتو بلێت ••• ئەی بۆ چ ڕێ بە ئافرەت نادەن لە مێردێك زیاتر بکات ( استغفر الله ) ئەگەر ووتمان ئافرەتێك چەند مێردێکی هەبوو ••• مێردی یەکەم حەز ئەکات لەگەل ژنەکەیا گەشتێك بکات و مێردی دووەم حەز ئەکات لەگەلیا بچێ بۆ سینەما و مێردی سێیەم حەز ئەکات لە مالەوەبن جا ئەو ساکە ئەبێ زۆران بازی بکەن کامیان سەرکەوت ئەو لەگەلیا بچێ‌یا بە دلی ئافرەتەکە بێت و لەگەل یەکێکیان بچێت و رق و کینە و پەژارە بۆ ئەوانی تر ئەمێنیتەوە داو ئەنێنەوە بۆ لە ناو بردنی یەك باسی تێکەلاو بوون ناکەین چونکە بابلێین هەر شەوە یەکێك ••• بەلام لە کاتی پشو دانا کامیان لە گەلیا دەسبازی بکەن •• یا خود ژنەکە کامیان ڕازی بکات لە جێبەجێ کردنی کاروباری ماو مال و رێك خستنی جێگا بۆ خوابلێین ئایا ئەم ئافرەتە لەبەرچ هۆیەك ئەم هەموو مێردەی کردووە ••• لەوکاتەی هۆیەکانی زیاتر لە ژنێك هێنانی پیاو ئاشکراو ڕوونە لە ڕێرەوی ئیسلامدا هەر کاتێك ئافرەت هەستی کرد کە مێردەکەی ناتوانێ مالەکەی ببات بەڕێوە و کاری ژن و مێردایەتی پێ ناکرێت دەتوانێ داوای جیا بوونەوەی لێ بکات جا ئەو چەند مێردەی بۆچی ••

ئافرەت لەیەك ساڵ یەكجار سكی دەبێت لە هەر چەند مێردەكەیا یەك منداڵی دەبێت لەوكاتەی پیاو لە چەندەها ژن سەرو منداڵی دەبێت و باوكیان دیارە ..

بەڵام ئەگەر باوك زۆر بوون ئایا ئەوكاتە منداڵەكە هی كامە باوكە ئایا دیسان دەبێ زۆران بازی بكەن ... ئەمەشتێكی وانی‌یە باوك بەزۆران بازی و ڕەش و سپیاتی دڵی بسرەوێ دەبێ لە خانم بپرسن ئەو منداڵە هی كامیانە ئەوە شتێكی ئاشكرایە لەیەزدان زیاتر كەس نازانی .. جا هەر كاتێ مێردەكان ئافرەتەكەیان بەرەڵلا كرد منالەكانیشی دەكەونە كۆڵ چونكە باوكی ڕاستەقینە دیار نی‌یە .

لە سەر هەندێ لایەنی چاكی زیاتر لە یەك ژن هێنان دەبێ ئەوەش بزانین كە لەگەڵ ئەو لایە باشانەی دا چەندە دەردوو ئاژاوەو سەر ئێشە دەگرێتە خۆی جا لەبەر ئەوە وەكو لە پێشا وتمان گەر زۆر پێویست نەبوو یەك ژن بەسەو پێویست بە ئاژاوەی ناوماڵ ناكات ...

ئەو كێشانەی دێتە ڕێی دوو یا سێ ژن ڕاگرتن ئەمانەن :ــ

١ ــ زۆر جار شەڕ و ئاژاوە ڕوو لە ماڵەكە دەكات بەهۆی لەیەك ڕازی نەبوونی هەوێ‌یەكان و ماڵەكە دەبێتە دۆزەخێك بۆ مێر دەكەیان .

٢ ــ زۆر جار لە كاتی بەشەڕ هاتنی دایكەكان (هەوێ‌یەكان) منالەكانی هەردوو لاش بەگژ یەك دەچن ئەوسا بە درێژایی ڕۆژ ئەو

منداڵە بەسەرزمانانە بەبێ ئەوەی بزانن بۆ شەڕ دەکەن هەر دوولا بەقسەی دایکیان سەرو گوێلاکی ئەوی‌تر دەباچێ •

٣ ـ وەکو خوای گەورە بۆمانی ڕوون کردۆتەوە پیاو ناتوانێ یەکجار دوو ژنی خۆش بوێ وەکویەك لەبەر ئەوە یەزدان داوای کردووە کە دەبێ مێرد دادپەروەر لە بەخێوکردنیان و ڕەفتاردا ، جارێکی تر دیسانەوە بەهۆی هەستپێ‌کردنی یەکێکیان کەوا مێردەکەی ژنەکەی تری خۆش ئەوێت زیاتر ••• زیز دەبێت و ئاژاوە لە ماڵەکە پەیدا دەکات •

٤ ـ یەکێ لە هەرە هۆیە گرنگەکانی بەرەڵلا بوونی منداڵو پەیدا بوونی گرێی دەروونی منداڵ لە دووژن هێنانو تەڵاق دانە •• چونکە زۆر جار زیاتر لەژنێك هێنان دەبێتە هۆی تەڵاق دانی یەکێکیان بۆ کەم کردنەوەی باری ئاڵۆزاوی ماڵەکە •

ئەمەش شتێکی تایبەتی‌یە هەموو یاسایێك لە جیهان لە پاڵ بەندو کاری چاك و ڕەوان •• دەردو ئاژاوەش دەگرێتەوە هیچ یاسایەك ناتوانێ بەدڵی هەموو دانشتوانی شارێك بێت •

# زیاتر لەیەك ژن ڕاگرتن یاسایەكی ڕەوشتی یە

گوتمان یاسایەكی ڕەوشتیە چونكە ڕێگەی پیاو نادات چۆن دڵی ویست و لەگەڵ هەموو ئافرەتێكدا تێكەل بێت •

ئیسلامی پیرۆز وای داناوە پیاو جگە لە ژنەكەی خۆی ناتوانێ زیاتر لەگەڵ سێ ئافرەت كۆبێتەوە لەو كاتەی پێش ئیسلام دەیان توانی لەگەڵ دەیا ئافرەت كۆبینەوە و تێكەل بن •

پیاوان ئەوەیان لا باشترە چونكە بەبێ ماندوو بوون و هەست بە لێپرسینەوەو بەبێ ئەوەی مارەیی پێویستی ناومال و ژن بەخێوبكەن ، ئەوەی دیانەوێ لەگەڵ دەیا ژنی بێگانەو بێ ئەوەی ژنی راستەقینە ئاگادار بێت كۆبینەوە •

لەو كاتەی ئافرەت وەكو كەلوپەلێك بۆ چەند ساتێك بەجوانی

سەیر دەكرێت و دوایی بێ ماڵ ئاوایی پشتی تێ دەكرێت • بەڵێ لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا زیاتر لەژنێك ڕاگرتن هەیە لەوكاتەی ئیسلام ئەو ڕاگرتنە لەبارێكی بەدڕەوشتی دەگۆڕێ بەبارێكی ڕەوشتی •• لە ڕۆژ ئاوا هەر پیارێك جگە ازژنی خۆی چەند ژنێكی تر دەناسێت و هەر شەوە لای یەكێكیان بەپێ دزە شەو دەباتە سەر بێ ئەوەی ژنی ڕاستەقینەی ئاگادار بێت و هەر كاتێكیش ژنەكەی بەم پەیوەندی یە ناراستەی زانی ئاسمان بەسەر مێردەكەیا دا ئەداو داوای جیابوونەوەی

لێ دەکات و جیا دەبنەوەو منداڵەکانیان دەربەدەر دەبن ••• بەڵێ لە ڕۆژئاوا لە جیاتی ژنی ڕاستەقینە بە ناوی دڵسۆزیو هاوڕێیاتی و دڵداری ئەم سەردەمە هەر پیاوێ چەندەها ژنی بێگانەی هەیە کە شەو لایان ڕابوێرێت •

لەو کاتەی هیچ یاسایەك نی‌یە لە جیهان بەمە ڕازی بێت ئایا ئافرەتەکانی ڕۆژئاوا بەمە ڕازین ؟ هەرکەسێ دەنگی ئافرەتانی جیهان لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بخوێنێتەوە وەڵامی ئەم پرسیارە دەزانێت •• زۆر لە مەسیحیەکان هێرش دەبەنە سەر ئیسلامی پیرۆز بەبیانووی ئەوەی کە موسوڵمانەکان لە ژنێك زیاتر ڕادەگرن ••• بەڵام جوانترین بەڵگەمان بە دەستەوەیە کەوا لە سەردەمی ( مەسیح سەلامی خوای لە سەر بێت ) زیاتر لە ژنێکیان ڕاگرتووە و هەروەها لە سەردەمی (موسا سەلامی خوای لەسەر بێت) بەڵێ ئەگەر مەسیحیەکان چاوێکی ڕاستەقینە بەتەورات بخشێننەوە ئەبینن کەوا داود پێغەمبەرو سولەیمان سەلامی خوایان لەسەر بێت کە تەورات بەجوانترین شیوە باسی کردون داود پێغەمبەر (٩٩) ژنی هەبووە و کاتێ ژنی سەر کردەکەی خۆی ( ئۆریا ) ی مارەکردەوە بوو بە ( ١٠٠ ژن ) سولەیمان پێغەمبەریش (س) هەروەکو تەوارات باس ئەکات (٧٠٠) ژنی ئازادو (٣٠٠) جاری‌یەی هەبووە کە بەجوانترین ئافرەتی سەردەمی خۆیان ناسرا بوون هەروەها هەموو پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیل زیاتر لە چەند ژنێکیان ڕاگرتووە لەوانە ( ئیبراهیم سەلامی

خوای لەسەر بێت ) لەو کاتەی پێغەمبەری ئیسلامی ئەمرو پیرۆز بە درێژایی تەمەنی و لەبەر چەند هۆیەکــی تایبەتی زیاتــر لەژنێکــی هێنا ... لەمانە هەشت بێــوەژن و هــەندێك پیرێــژن بوون و تەنهــا یەکێکیانی بەکچی هێنا .

## یاسای زیاتر لە یەك ژن لە قورئاندا

قورئانی پیرۆز بەرێك و پێکی و جوانترین شێوە و بــە ڕاستەو ڕەوانی ئەم یاسایەی ڕوون کردۆتەوە لە سوورەتی (النساء) ئەفەرموێ [ وان خفتم ألا تقسطوا في اليتامى فأنكحوا ما طاب لكم مــن النساء مثنى وثلاث ورباع ، فأن خفتم ألا تعدلوا فواحدة او ما ملكت ايمانكم ذلك ادنى ألا تعولوا ][1] .

هەر لە هەمان سوورەتدا ئەفەرموێ [ ولن تستطيعوا ان تعدلوا بين النساء ولو حرصتم فلا تميلوا كل الميل فتذروها كالمعلقة وان تصلحوا وتتقوا فان الله كان غفورا رحيما ][2] .

لەم دوو ئایەتە ئەمەی خوارەوەمان بۆ دەرئەکەوێ :ـ

١ ـ پیاو ئەتوانێ تا چوار ژن ڕاگرێت و کە ئەفەرمووێ(انكحوا) هەر چەندە ( کرداری داوا ) یە بەڵام بۆ گونجانو لوانە نــەوەك بۆ پێویست .

---

(١) النساء ئایەتی (٣) .

(٢) النساء ئایەتی (١٢٩) .

٢ ـ زیاتر له ژنێك ڕاگرتن بەندە بە مەرجێ کە داد پەروەری تیابێ کەسێ کە نەتوانێ دادپەروەری لە نیوان ژنەکانیا بلاوکاتەوە بۆی نییە لە ژنێك زیاتر ڕابگرێت ( فان خفتم انلاتعولوا فواحدة ) •

٣ ـ زیاتر لە ژنێك ڕاگرتن بەندە بە مەرجێ کە مێردەکە بتوانێ بەرێك و پێکی دوو خێزان بە خێو بکات (ألا تعولوا)وا ئەگەیەنێ کاتێ کەمنالی لە چەند ژنێکا زۆر بوو وەنەی توانی بەخێویان بکات ••• باشتر بوو یەك ژنی هێنا بایە تا منالی زۆر نەبێت[1] •

٤ ـ لە ئایەتی دووەم وا ئەگەیەنێ کەمێردەکە تەنها لەسەری پێویستە دادپەروەر بێت لەنیوان ژنەکانیا لە بەخێوکردن و جل و خواردەمەنی و کەرەستەی ناومال •

بەلام ناتوانێ دادپەروەر بێت لە خۆشەویستیانا بۆیە لەسەر مێرد پێویستە بەجارێك ڕوو لە یەکێکیان نەکات و پشت لەوانی تر نەکات وەکو لەوئایاتە ڕوونی کردۆتەوە ••

[ ولن تستطیعوا ان تعدلوا بین النساء ولو حرصتم فلا تمیلوا کل المیل فتذروها کالمعلقة ) •

هەر وەکو پێغەمبەر (عائشە) ی لە هەموویان زیاتر خۆش ئەویست و دلی ئەوانی تریشی نەئەشکاندبەجۆرێ ئەمخۆشەویستیەی ( عائشە ) کاری نەئەکردە سەر ئەوانیتر •

---

(١) تفسیری شافعی

هەروەها پێغەمبەری ئیسلامی پیرۆز لەو نەخۆشیەی کەپێی کۆچی دوایی کرد زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی هەر شەوە لای یەکێك لە ژنەکانی بێت بەلام لەبەر ئەوەی نەی‌ئەتووانی بەپێ بڕوات بە کۆل لەو مال بۆ ئەو مالی ژنەکانی هەلیان ئەگرت و .. وەلەو کاتەی کەنەی ئەتوانی لە جێگای بجوولێتەوە مۆلەتی لە هەموو ژنەکانی وەرگرت کە ڕێگەی بدەن لەلای عائشە بمێنێتەوە تا گیانی پاکی ئەسپێرێ . هەموو ژنەکانی مۆلەتیان داو لەمالی عائشە مایەوە تا کۆچی دوایی کرد و رووی زەمینی تاریك کرد . لێرەوە ناتوانم هیچ جۆرە وێنە یەك لەم وێنە جوان‌تر و پڕ لە ڕەوشتی بەرزی مرۆڤایەتی و بێ وێنەیی بۆ خوێنەران بهێنم کە پێغەمبەری مەزنی ئیسلام چەسپاندی .

موسولمان کاتێ لە ژنێك زیاتر ڕائەگرێ ئەبێ دادپەروەر بێت بزانێ خوای گەورە هەموو کاتێك چاو دێری ئەکات و ئەنوارێتە جۆری ڕەفتاری لەگەل ژنەکانی .

## « زیاتر لەژنێك ڕاگرتن و موسلمانانی ئیمرو »

ئەبی هەموو پیاوانی موسلمانی ئیمڕۆ ئەوە بزانن کەوا لەبەر ئەو چەند هۆیە تایبەتیانەی لەپێشەوە باسمان کرد زیاتر لەژنێك ڕاگرتن درووست نی‌یە لەبەر ئەوەی زۆر ترین موسولمانانی ئیمرۆ کە زیاتر لە ژنێك پێکەوە ئەبەستنەوە لە یاساو پەیرەوی ئاینی ئیسلامەوە بێ ئاگان‌و شارەزایی‌یەکی ئەوتۆیان نی‌یە ٠ جگە لەوەی کە مێرد لەو وەختەدا ناتوانێ دادپەروەر بێت لە نێوان ژنەکانیا لەبەر باری گرانی ژیان شێوانی باری ئابووری لەناو خێزان‌و پاش ماوەیەك شەڕو ئاژاوە لە مالەکە پەیدا ئەبێت و ناچار ئەبێت پیاوەکە هەندێکیان تەلاق بدات یا زۆر جار وابووە پیاوەکە تووڕە بووەو هەموو ژنەکانی تەلاق داوەو ٠ ٠ منالەکانیش لای خۆی هێشتۆتەوەو بەرەللای کولانانی کردوون ، لەگەل ئەوەشی ئافرەتانی ئیمرۆ لە یاسای ژن و مێردایەتی کە ئاینی ئیسلام دای‌ناوە بێ ئاگان زۆرترین شەڕو ئاژاوەی ناومال لە نەزانینی یاسانی ئیسلامەتی‌یە کە ئافرەت بە درێژایی ژیانی چاوی پێ نەکەوتووە هەروەها شتێکی نەگۆڕاوە هەرکاتێ پیاوەکە ترسا لەوەی کە دادپەروەری لە نێوان ژنەکانی ناکات ئەوەبێ شك زیاتر لە ژنێك هێنان قەدەغەیە ئێمە ناتوانین لە هەموو بارێکا زیاتر لە ژنێك ڕاگرتن قەدەغە بکەین چونکە بەم جۆرە ئەو کەسەی لەهەموو بارێك ئەم یاسایە قەدەغە بکات سنووری خوای گەورە ئەشکێنێ ٠٠٠ بەلام ئەم یاسایەش چەندەها مەرجی تایبەتی هەیە بۆ چەسپاندنی ٠٠٠ وەکو باسمان کرد ٠

# پیشەی ئافرەت

کاکردنی ئافرەت لە وولاتانی ڕۆژئاوادا بۆتە کارێکی پێویسترو و سەرەکی بۆ ئەوەی ئافرەت خۆی لە چرنۆکی بێ بەزەیی یانەی پیاوانی حەزو چێژ پەرست ڕزگار بکات کە لەگەڵ پێش کەوتنی شارستانیەتی وولاتانی ڕۆژ ئاوا .. ئافرەت لە هەموو بوونەوەرێك زیاتر یاری بە هەستو نەستو ویستەکانی دەکرێت .

ئافرەت وەکو هەموو کەسانی تری وولاتانی ڕۆژئاوا دوو چاری کێشەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی بووە .. تا ئێستا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نەی توانیوە یەکسانی بخاتە نێوان هەموو چینەکانی گەلان بەلکو تا ئێستا پیاو ڕۆژانەی لە ئافرەت زیاترە .. لە وولاتانی سەرمایەداریدا گەر ئافرەت خۆی ژێر دەستی سەرۆك کارگەو سەرۆك کارێکی نەخات و حەزی خۆی پیا نەڕێژێت .. کاری دەست ناکەوێ بەلکو زۆرجار ئافرەت ( لە ئازادی ) قەدەغە دەکرێت گەر هەموو شەوێك لە پاڵ سەرۆك کارەگەی ڕۆژ نەکاتەوە .
لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەوەی ئافرەت دەرگای هیچ یاسایەکی بۆناکرێتەوە کەبەرزی و ئازادی و پیرۆزی مرۆڤایەتی بپارێزێت و لە کێشەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی هاودەمێك خەم خۆری بێت .. ئافرەت لەم وولاتە دەبێ کار بکات بۆ ئەوەی بژیت ..

ئافرەتی ڕۆژئاوا وەکو ئێمە تێی دەگەین وانی‌یە کە ڕووت و بەڕەڵلاو لە شەقام و باخچەکانا لەگەڵ لاوان دەگەوزن ٠٠ ئافرەتی ڕۆژئاوا چەوساوەترین ئادمیزادە لە جیهان تەنها لەڕۆژێکدا دەبێ لە ڕۆژانەیەکی کەم لە بەیانی تائێوارە لە جێگای ( تەنگ و پڕدوکەڵ ) دا بژیت و لەگەل دەنگی مۆسیقای ئەو شوێنە بلەرێتەوە بەبێ ئەوەی حەزبەو کارە بکات بەناڕەزایی لەپاش ئەم دەردە سەریە دەبێ شەو بەگەوزدان لەگەڵ ڕەزاگرانێك بکاتەوە زۆرجار کە تەنها دادەنیشێ بۆ حاڵی پەشێوی خۆی دەداتە بڕمەی گریان بەڵام چی‌بکات یاسایەك نی‌یە ڕێگەو شوێنی کارکردنێکی بشەرەفانەو بڕ ڕێزی بۆ دابنێت بەدوای گەنجێك دەگەڕێت بێتە هاوسەری و لەوئازارە ڕزگاری بکات بەڵام لەگاڵتە کردن‌بە شەرەف و هەستی ئەوزیاتر چی‌تری لێ دەست ناکەوێ ئافرەتی ڕۆژئاوا حەز دەکات خۆی کەیبانووی ماڵێك بێت‌و لە جیاتی گوجیلە سەگ‌و پشیلە ، ووردیلەکانی بگرێتە باوەش‌و بە زەردەخەنە باوەش بۆ مێردەکەی بکاتەوەو لەسەر سینەی بی حەسێنێتەوە ٠

ئافرەت بۆ پاراستنی ڕێزو بەرزی خۆی گەر زۆر پێویست نەبێ کار نەکات باشترە تا ئەوکاتەی یاسای خواوەندی گەورە دەچەسپێت لە هەموو کارو باری ژیان ئافرەت کارێکی تایبەتی بۆ دادەنرێت و ڕۆژانەی تەواوی خۆی لە سەری وەردەگرێت ٠



# کارکردن‌و بووژانه‌وه‌ی که‌سایه‌تی ئافره‌ت

ده‌ڵێن : ئافره‌ت بۆ فراوان کردنی ئاسۆی ، پێویسته‌کار بکات و له چوار چێوه‌ی ماڵ ڕزگار بێت •

له‌کاتی پێویستیدا کارکردن له‌ده‌ره‌وه به‌پێی ڕێ‌و شوێنی ڕێڕه‌وی ئیسلام قه‌ده‌غه نه‌کراوه له ئافـره‌ت •• بـه‌ڵام ده‌بێ شتێك بـزانین به‌تایبه‌تی ئافره‌ت خۆی ئه‌و شته‌ش کاری تایبه‌تی ئافـره‌ته هـه‌روه‌کو له‌پێشان باسمان کرد پسپۆری ئافره‌ت له‌ماڵداری و په‌روه‌رده کردنی خێزان به‌گشتی هه‌رکاتێك ئافره‌ت له‌وکاره تایبه‌تیه‌ی که‌م ته‌رخه‌می کرد هه‌رچه‌ند کاری ده‌ره‌وه‌ی سه‌رکه‌وتوو بوو بێ‌شکه به‌که‌سێکی که‌م ته‌رخه‌م ده‌ژمێررێت••(چونکه)بۆی هه‌یه له‌پیاوان هه‌بن کارێك وه‌کو ئه‌وکاره‌ی ئافره‌ته‌که له‌ده‌ره‌وه‌ی‌ئه‌نجامی ده‌دات پیاوه‌که‌ش به ئه‌نجامی بگه‌یه‌نێت ••• ( به‌لام ) کاری تایبه‌تی ئافره‌ت که ماڵـداری و په‌روه‌رده کردنی خێزانه •• به‌ڕێوه بردنی ئه‌و ( ده‌وڵه‌تۆکـه ) گه‌ر به‌خۆی نه‌بێت خۆی ئه‌نجامی نه‌دات بێ‌شکه پیاو هیچ سه‌ری لێ ده‌رنا کات و ئافره‌ت له به‌ڕێوه بردنی ئه‌م ده‌وڵه‌تۆکه‌یه کـه خێزانه ناوکی کۆمه‌ڵگایه‌کی ڕه‌سه‌نه سه‌رکه و توویه‌کی ئاشکرا نیشان ده‌دات بسه‌ر هه‌موو چینه‌کانی تری ئاده‌میزاد •• به‌ڕێوه‌بردنی ماڵ و خێزان له به‌ڕێوه بردنی زۆر کۆمپانیاو دام و ده‌زگا گرانترو زه‌حمه‌ت تره •

ئافـره‌ت جگـه لـه‌و کـاره‌ی پێویستی بـه‌زانین و

ڕۆشنبیرێکی تەواو هەیە بۆ ئەنجام دانی کاروانی خێزان بۆ پەروەردە کردنی منداڵ گەر ئافرەت لە ژێر یاسایەکی ڕەسەن و ڕاست بژیت و یاساکە ڕێزو بەرزی بپارێزێت و بژێوی و جێگای دانەوەی بۆ پەیدا بکات بۆ ئەنجام دانی کارە گرنگەکانی خۆی ، ئافرەت پێویستی بەخۆ هیلاك کردن و حەز بە بەرەللایی و تەنهایی ناکات ••

گرنگترین کاری ئافرەت چارە سەرکردنی دەردەکانی خێزانە و ڕۆلێکی گرنگی لە دەروونی کەسانی ناوماڵ دا هەیە •

کاری تایبەتی و ڕەسەنی ئافرەت لە ناوماڵدا زۆر لەوە بەرزترە کە بچێت لە کارگەیەك یا کۆمپانیایەك ( بەبالای خۆی جل و بەرگ نیشانی خەڵکی بدات ) یا کەل و پەل بخاتە کیسەیەك و پێش کەش کڕیاران بکات یا بە دیار چەند لاپەڕەیەکی نووسینەوە گرنگ ترین ماوەی ژیانی بباتە سەر لەوکاتەی مرۆڤایەتی جیهان پێویستی تری بە ئافرەت هەیە بۆ پێش کەش کردنی ڕۆڵەی دلێرو بیر تیژوو ڕۆشنبیرو نەبەز •

کچە نووسەری ئەمەریکایی ( فیلیس ماکجنلی ) لە ووتارێك بەناوی : « ماڵ دەوڵەتی سەربەخۆی ئافرەتە » دا دەڵێت [ ئێمەی ئافرەت پاش ئەوەی سەربەستی خۆمان وەدەست هێنا ئایا تاوان و درۆمان لەگەڵ ڕەگەز و توخمی خۆمان کرد کاتێ لە ماڵ هاتینە دەرەوە ؟! ] خۆی وەڵامی ئەم پرسیارەی خۆی دەداتەوە و دەڵێت :

[ من بیرو ڕای تایبەتیم هەیە دەربارەی ئـەم خاڵـە ٠٠ من سوورم
لەسەر ئەوەی ئافرەت کاتێ دەبێتە کەیبانوو لە ماڵەکەی‌خۆی‌دا زیاتر
مافی خۆی وە دەست دێنێ ٠٠ ڕێزوو گرنگی کاری تایبەتی ئافرەت
لە هەموو شتێك پیرۆز ترە بەلای منەوە بەسە کەوا هەموو لایەنێکی
دڵو دەروون و ژیـان دەگـرێتەوە ][1] ئەوە ووتـەی ئافرەتێکـی
هاوچەرخی ڕۆژ ئاوایە کەنایەوێ درۆ لەگەڵ وێژدان و پیشەی خۆی
بکات و ڕاستی نیشـان دەدات کـاری ئافرەتـی ڕامیـاری و چـارە
سەرکردنی لەپێناوی پاسەوانی بەرزی کۆمەڵ و بوژاندنەوەیەتی ٠



## کاری ئافرەت و بوژاندنەوەی نەتەوایەتی

دەڵێن :ـ بوژاندنەوەی نەتەوەکان لە زۆری ئیش کـەرانە جـا
لەبەر ئەوەی ئافرەت نیوەی کۆمەڵە نابێ ئەو نیوەیە بێ‌کـار بێـت و
کارنەکات ٠٠٠ ئەوە تاڕادەیەك ڕاستە نابێ چاوپۆشی لێ‌بکرێت
بۆئەوەی نەتەوە پێش بکەوێت و یارمەتی بدرێت لەلایەن ڕۆلەکانیەوە
بۆ بووژاننەوەی دەبێ ئەو دوولایانە ڕەچاو بکرێت‌لایەنی (گیانی)کە
بەهێزی باوەڕو شانازی بە خێرو سامانی وولات و بەرزی و پیرۆزی
ڕێڕەو وەدەست دێت ٠ لایەنی هەستی کە بەهێزی سوپاو ئـابووری
وولات دێتە دەست جا تا لەو دوو لایانە سەرکەوتوویی هـەبێ ئـەوا

(١) گۆڤاری المختار ژمارەی مارسی ١٩٦٠ ٠

هـەردەم نەتەوە لە بووژانەوەدا دەبێت و پێش دەکـەوێت و هـەر لەوکاتـەی ڕێرەوی ئیسلام بوو بەیاساو باوەڕی هـەردوولایەنی ئاشکرا کردوو داوای کرد یەکەم : کە تا توانا هەبێت دەبـێ یاسای ئیسلامەتی بە پیرۆزی و بەرزی ڕابگرین و ئەو خوایەی توانای ئەوەی هەیە سەرمان بخات بی‌پەرستین و مل کەچی بین و لەوزیاتـر سـەر شۆڕی کەس نەبین : [ فأتقـوا الله ما استطعتم ] هـەروەها لەلایەنـی دووەم دا ئیسلام داوای هێزو سوپاو یەکگرتنی موسولمانان دەکات بـۆ سەرکەوتن بەسەر لا دەر و بەدڕەوشتان [ واعدوا لهم ما استطعتم مـن قوة ] یانی ئەو پەڕی تواناو ووزەو ئامادەیی‌و ڕاوەستـان بەرامبـەر دوشمنان .. ڕاپەڕاندنی ئەو دوولایانـە لەسەر ئافـرەت و پیـاو بەیەکسانی ئەرکی سەرشانە ... ئافرەت و پیاو بوژاندنەوەی نەتەوەو وولاتەکەی لە سەریان پێویستە هەریەکە بەپێی پسپۆری کاری تایبەتی خۆی دەبێ کار بکات .. پیاو بۆ بەرهەم هێنان‌و بوژاندنەوەی سامان‌و وەدەست هێنانی خۆراك . ئافرەتیش بۆ کارێکی گـران تـرو پیرۆز تر کە دەبێ هەموو هێزوو وزەی خۆی بۆ بەڕێوە بردن و بووژانەوەی خێزانەکەی بخاتە کار .

ئافرەت لەماڵەوە کەسێك نی‌یە دەست لە ئەژنۆی دانیشتبێ لە چوارە دیواری ئەوماڵە بەلکو کەسێکە لەناو ئەو چوار دیوارەی ماڵدا کاری زۆر گرنگ ترهەیە کەپیاو لەناو چوار دیواری کارگەو دام و دەزگا کان ئەی‌کات .

ئافرەت لەناو ئەم چوار دیوارەو دەرەوەیدا منالەکەی یانەو ڕۆلەی لە دوا ڕۆژ نەتەوەکەی دەبوژێنێتەوە تۆمانک لەسکیا هەلی دەکرێت و ئازاری منالبوون ئەچێژێت و شیر بە منالەکەی دەدات و پەروەردەی دەکات و لە خێر و خۆش مێردەکەی ئاگادار دەبێت و لەکاتی منالْ بوون و نەخۆشی مێردو منالەکانی یارمەتیان دەدات لە هەموو هەلس و کەوتێکا •• مالەکەی بەڕێوە دەبات لەبەیانی تائێوارە لەڕازەی کەسانی تردایە بەرهەمی جێنیشینی و خۆشەویستی و دایکایەتی گیانی و کۆمەلایەتی پەیدا ئەکات ئافرەت لێرە بەتەنها ئادەمیزادێکی خۆشەویست نییە بەلکو بۆ کەسانی تر ئارەق دەرێژێت •

هەموو هێزو توانای تەرخان دەکات بۆ وەدەست هێنانی یاسایەکی تایبەت بە هاوسەرێتی و دایکایەتی •

ئایا ئەمە گرنگ ترین ( هۆ ) نی‌یە بۆ درووست کردنی ئابووری‌و گیانی نەتەوە •• ئافرەت و پیاو گەر بەتەواوی کاری خۆیان ئەنجام دا نەتەوە پێش دەکەوێ بەلام هەریەکێك کەم تەرخەمی لە کاری تایبەتی خۆی کرد ئەوا تاوانێك بەرامبەر نەتەوەکەی دەکات • نەتەوە بە بەرەللایی و دوور لە یاسای خواوەندی گەورە و ڕێڕەوی ئیسلام پێش ناکەوێ ••

نەتەوە پێش ناکەوێ گەر نیوەی یا هەمووی نەزان‌و بێکار بن ئافرەتی ئێمە نابێت چاو لە ئافرەتی ڕۆژ ئاوا بکات •

چونکە بارو ژیانی ئافرەتی ئێمە جیاوازە لەگەڵ ئافرەتی ڕۆژئاوا ، ئافـرەتی ئێمـە پێویستی بە زانستی و ڕۆشنبیری هەیە بۆ ماڵداری ئافرەتی ئێمە خۆشەویستیەك گەر لە پێناوی هاوسەرایەتی نەبێت یا دایکایەتی نەبێت نایەوێت ، ئافرەت پێویستی بە بـارێکی زانست و ڕێرەوێك هەیە کە لە درۆ و دەلەسەی جەز پەرست و چێژ پەرستان دووریان بکاتەوە کە داوای ئافرەت دەکەن لە دەوڵەتی سەربەخۆیی خۆی بێتە دەرەوە بچێتە ژێـر دەستی کەسانی تـر بـە نـاوی بووژاندنەوەی نەتەوە ئایا کەی لای ئێمە پیاوان بەشی کاری دەرەوە ناکەن تا ( نیوەکەی ) تر کار و پسپۆری خۆیان جێ بهێڵن و ڕووبکەنە دەنگ و ئاژاوەی کارگە و کۆمپانیاکان •



## ئەو خاڵانەی پێویستە ڕوون بکرێنەوە

یەکەم :ـ ئەگەر هات و فێری ئەو زانست و ڕۆشنبیری‌یە بووکە ڕێرەوی ئیسلام بۆی داناوە و لە ڕاستی خۆی و پەیامەکەی و کاری سەرشانی گەیشت و پەیام و کـاری سەر شانـی بـە ڕێـك و پێکـی بەڕێوەبرد و بەرهەمی خۆی پێگەیاند لە ناو ماڵ و بەرامبەر منداڵەکانی و مێردەکەی و کۆمەڵەکەی ئەو ئافرەتە بە ئافرەتێکی دەست بەتـاڵ ناژمێردرێ •

دووەم :ـ پشت گوێ خستنی پەیوەندی هەوسەرێتی و دایکێتی و شکاندنی ئەو پەیوەندیەی بەخۆشەویستی و میهرەبانیو جێنشینگەی گیان و پەروەردەکردنی وەچەی دوا ڕۆژی کە بەخۆشەویستیەکەی ئەو تۆ دایك و منالەکانی بەیەك دەبەستنەوە لەو پەڕی بەخشین دایە دەبێتە هۆی بۆشایی‌یەکی زۆر فراوان نەك تەنها لە دل و دەروونی ئافرەتەکە بەلکو لە دڵ و دەروونی هەموو ماڵ و خێزانەکە ‎•‎• تا کەل و پەلی ناومال مان لە جوانی و ڕەنگینی دەگرن ‎•‎• بۆی هەیە بلێن ئافرەت دەتوانێ کاری دەرەوە بکات و کاروباری ماڵداریش پشت گوێ نەخات ‎•‎• ! ئێمەش دەڵێین لێرەدا دان نرا بەوەی کەوا ماڵداری کارێکە نابێ پشت گوت بخرێت و کارلە ناو ماڵەکەیدا بکات بە دەست بەتال دانانرێ ‎•‎• کەوایە ئەی ( پێشکەوتنخوازان ) چۆن ویژدانتان قەبول دەکات لەو کاتەی ئێوە تەنها کاری دەرەوە دەکەن‎•‎•ئافرەتیش لە بەیانی تا ئێوارە لە کارگەیەکا بە دیار ئەڵەتێك یا بەدیار نووسین و چاپکردنەوە بووەستێت و کاتێ دەگەڕێتەوە ماڵەوەش هەموو ماڵەکە پێویستی بەو ئافرەتە ماندووە هەیە منالەکانی داوای هەستو سۆزی دایکیان دەکەن کە ساتێك بە دیاریانەوە دانیشێ و پیاوەکەی داوای دەکات سەرێك بخاتە سەر سینەی نەرمی و لە ماندوو بوونی ڕۆژانەی بی حەسێنێتەوە ‎•‎• ماڵەکەی بە جارێك بانگی دەکات بۆ پاك کردنەوەی بۆ چێشت لێنان و شوشتن ‎•

( پیاوەکان ) نەختێك بەزەیی تان بە ئافرەتەکانتان بێتەوە تا لە

سەربازگاو مەڵبەندەکانیش بۆ ئەو کارانە چەند کەسێکی تایبەتیان داناوە و جگە لەم کارە هیچ شتێکی تر ناکەن •

لەو کاتەی ئافرەت لە ناو ماڵەکەیدا دەسوڕێتەوە بۆ ڕاژەی ماڵو منداڵەکانی کار دەکات خۆشترین جوانترین کاتی کامەرانی و بەختیاریەتی بۆ چارە سەرکردنی ئەو کێشەیە تەنها دوو ڕێگەمان هەیە یا ( ئافرەت بگەڕێتەوە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی و لە ماڵداری زیاتر هیچ نەکات یا ماڵداری و خێزان داری و منداڵ بوون و پەروەردە کردنی منداڵی بێ ناوێ هەمووومان بە ئافرەت و پیاوەوە ڕوو دەکەینە کارگە و دەزگاکان کار دەکەین ) •

ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەی [ دووەممان ] بەلاوە باشتر بوو گەر بۆمان بچوایە سەر بەلام ناچێتە سەر چونکە یەزدانی گەورە و پەروەردگار وای کردووە کە بۆ ڕێ ڕەوی کاروانی مرۆڤایەتی هەموو کاتێك نێر و مێ پێویستیان بە یەکتر هەبێت ، هەروەك چۆن بەبێ $H2 + O^2$ ئاو پەیدا نابێ : ئەو پەیدا بوونەشی یاسایەکی تایبەتی دەوێ وەك و هەموو پەیوەندیەکانی تر ، جیهان لە سەر خێزان وەستاوە ، خێزان ناوکی هەموو کومەلگایەکە کومەلێکی یەکگرتوومان نابێ بەبێ خیزانێکی یەکگرتوو بێ کێشە ، ئەو شتانە هەمووی سەلماون پێویست بە دوو بارە کردنەوە ناکات ئەی ( پیاوەکان ) ئەگەر ئەو ئافرەتانەی بوونەتە هاوسەرتان نەبوونایە دەبوایە ئافرەتێك بە

پارە و پولێکی زۆر بەکرێ بگرین بۆ بەڕیوەبردنی ماڵەکەمان ئـەو ئافرەتە کرێ گرتەیە بە پەیوەندیەکـی مادیەوە بەستراوە بەماڵەکە ، لەو کاتەی هاوسەرەکانتان هەموومان و نەمان و پەیوەندیەکی دەروونی گیانی دەیان بەستێتەوە بە ماڵەکانتان •

فەیلەسووفی ئیرلەندی بەناوبانگ ( برنارشۆ ) لەو بارەیـەوە دەڵێ : ـ ( ئەو کارەی ئافرەت دەی کات بە هیچ کەسێکی تر ئەنجام نادرێت ئەو کارەشی منداڵ هەڵگرتنە لە سکداو منال بوون و شیر پێ دان و ماڵداریە بۆ پەروەردەکردنی منالەکانی و هیچ کاتێکیش ئـەو ئافرەتانە لە بری ئەو کارانە پولێك وەرناگرن ) •

ئەوە وای لە زۆرترین کـەسان کردووە کـە ئەوانە بەکار دانانێن چونکە بەرامبەر بە کارەکەیان هیچ شتێك ئەوەندەی کارەکانیان ناهێنێ کە وەری بگرن هەر کاتێك باسی پیاوکـرا دەڵێن هـەر پیـاو تێکۆشەرە بەرهەم هێنەرە زیاتر لەم پیاهەڵدانانە بە نەزانی • بـەڵام ئافرەت لە ماڵەوە کار نەکات و کارەکەشی لە ماڵەوە گەورە تریـن پێ ویستیە بۆ مانەوەی کۆمەل لەو کاتەی ملیونەها لـە پیاوان کاتـی خۆیان بە کاری پڕ و پوچ دەبەنە سەرو و سینە دەر دەپەڕێنن کـەوا ژنەکانیان بەخێو دەکەن ، لەگەڵ ئەوەشی پیاوان لە خۆبایین نایانەوێ لە هیچ بگەن •

# یەکەم

[ لە نێوان سەر بەرزی و یارمەتی داتی هاوسەرەکانیان ]

کاتێ ئافرەت سەر پەرشت کەری ماڵەکەیەتی و لە مێردەکەی دوور ئەکەوێتەوە ٠٠ بە هەر چی هۆیەك ئافرەت ئەبێ کار بکات بۆ ئەژەی خۆیی و منالەکانی بەسەر بەرزی بژین و چاو لە دەستی ئەم و ئەو نەبن ٠٠٠ بەلام ئێمە لەو کۆمەلگایەی تیای دا ئەژین جیاوازی هەیە لەگەل کۆمەلگای ڕۆژ ئاوادا :ـ

١ ـ لە کومەلگای ڕۆژ ئاوادا هەر ئافرەتێ گەیشتە ئەو ڕادەیەی بتوانێ لە دەرەوە کار بکات ئەبێ کار بکات چونکە لەم وولاتانە پەیوەندی نزیکایەتی خزمایەتی و میهرەبانی زۆر بێ هێزە نەوەك کەسانی تر بەلکو زۆر لە ئافرەتان گەر کار نەکەن مێردەکەنیان نانی ئێوارەیان بۆ پەیدا ناکەن جا چ جای ئەوەیە ئافرەتێك مێردەکەی بمرێت یا تەلاقی بدات کەسێکی تر بە خێوی بکات بەلام لەو کۆمەلگایەی ئێمە کەوا پەیوەندی دۆستایەتی و نزیکایەتی زۆر بەهێزە ئافرەتێك گەر مێردەکەشی لێ دوور کەوێتەوە کەس و کاری ئافرەتەکە لێی دوور ناکەونەوە و ئاگاداری هەموو کەمو کورتیەکی ئەکەن نایەلن هیچ ناخۆشیەکی هەبێت هەر وەکو ئەزانیت چەندەها ئافرەت تەلاق دراوە یا مێردەکەی مردووە بە سەربەخۆیی و ئازادی لە مالی باوکی یا براکەی ماوەتەوە ٠٠

ڕەنگە هەندیك بڵێن سەر شۆڕی یە ئافرەت بێ کار بگەڕێتەوە ماڵی کەس و کاری ... ئێمەش ئەڵێن نەخێر بەڵکو زۆر لە کەس و کاران خۆیان بە سەر شۆڕ ئەزانن کاتێ ئەبینن ئافرەتێکیان کار لـە دەرەوە ئەکات و یارمەتی نادەن بۆچی ئافرەت بچێتەوە لای کەس و کاری لە ماڵەکە دا هیچ کارێك ناکـات ؟.. ئافـرەتی ئێمـە لـە میوانداریش کاری خۆیان ئەکەن و ماڵداری بەشێکە لە ژیانی ڕۆژانەی ئافرەت ، ئافرەتی بێ ماڵ بەندەیە بێ داڵدەیە بۆشایی‌یەك بە قەدەر ئاسمان ئەیگرێتە خۆی :ـ

ئەم ئافرەتە لە ماڵی کەس و کاری کار بکات تا خوا دەرگایەکی لێ ئەکاتەوە باشترنی‌یە لە ژێر داو و ویستی ئەموو ئەو بێت لە کارگەکان جار جار بە پەلارێکی لاسارەکـان زامـار بێت هەمووما‌ن ژیانی کارگەو دەزگاکان ئەبینن کە پیاوەکانیش ناڕازین .

٢ ـ گەر بڕوانینە کاری ئافرەت و پیاو ئەبینین بۆ پێویستەکانی ژیان و بەرزی نەتەوە و وولات ئەبینین ئافرەت بەرە و ناوەڕۆك چووە لەو کـاتەی پیاوەکـەی بەرامبەر ئـەم ناوەڕۆکـە لـە ڕۆلی دووەم ئەخولێتەوە ... ئەم ناوەڕۆکە بەرهەم هێنانی ژیانە پەروەردەکردنـی ژیانە ئایا بۆ ئەم کارە گەر کرێی بوایە ئەبوو ڕۆژانەی ئافرەت چەند بووایە بەرامبەر بەپیاو تەنها لە کاتی منـال بوون ... یا شەوێك لـە شیرین خەوا بە دیار کوریەکەی دابنیشێ‌و یاکوریە نەخۆشەکـەی

ئەلاوێنیتەوە ئەبێ کرێی ئەم کاتانە چەند مثقـال زێڕ و گەوهـەر بوایە ••• بەرامبەر بە کاری پیاو کە چەند کاتێك بە سەر مێزەکەیەوە کارێك یا بە ڕۆژنامە خۆی خەریك ئەکات ••• ئەی پیاوەکان ئێـوە داوای ئافرەتەکان ئەکەن لە ماڵ بێنە دەرەوە تەنها بۆ ڕۆژێك خۆتان تاقی بکەنەوە لەماڵەوە کارەکانی ئافرەتەکانتان بگرنە دەست •••

ئافرەت گەر کەس نەبوو بە خێوی بکات لەو کاتە ئەتوانێ کار بکات بەڵام ئەم کار کردنە نا چاری‌یە و لە :ـ

أ ـ کەمتەر خەمی کۆمەڵە بەرامبەر کـار و فەرمانەکانـی و یارمەتی دانی هەژاران و لێ قەومـاوان و پشت کۆمـاوان و دەست کورتەکان •

ب ـ نەبوونی هەستی مرۆڤایەتی بەرامبەر بە ئافرەت کـەوای لێ ئەکات خۆی‌سەر شور نەکات بۆ هیچ‌کەسێك و بچێت کار بکات•

بۆیە یاساو دادپەروەری ئیسلام مافی ئافرەتی لە ماڵـی دارایی ( بیت المال ) بۆ دەست کورتەکان کە خۆی پێ بژینێ و چاوی لـە دەستی ئەم و ئەو نەبێت هەروەکو خوای گەورە ئەفەرمووێ :ـ

[ وفي اموالهم حق للسائل والمحروم ]

گەر کۆمەڵگایانی جیهان لە سەر ئەم ئایاتە پیرۆزە برۆیشتانـە دەردەسەری و هەژاری و دەست کورتی و دووبەرەکی چینایەتی لە ناوا پەیدا نـە ئەبوو •

دووەم :-

## لە نێوان ماڵداری و ... کاری دەرەوەی ماڵ

یەزدانی گەورە بۆ درووست کردنی نێر و مێ لە هەر مشتێکا مەرام و ویستێکی تایبەتی خۆی تیا هەیە .. نێر و مێ لە ئادەمیزاد وەکو یەکن بۆ ئەو کارەی بۆی هاتوونەتە بوون ... هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێ [ وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون ] بەڵام لە دابەش کردنی کار و پسپۆرایەتی بەسەر هەر یەکێکیان ئەوە هەر یەکێك لەم نێر و مێیە کار و پسپۆرایەتی تایبەتی خۆی هەیە ئەگینا ئەم نێر و مێیە بۆچی هەموویان نێر یا مێ نەبوون... کەسێك لەو نێر و یا مێیە ناتوانێ کاری ئەوی تر بگرێتە دەستی بەبێ زیان لە کۆمەڵدان ئافرەت هەموو کارێکی دەرەوە بکات و واز لە پسپۆری خۆی بهێنێ و پیاو بە منداڵ بوون و پەروەردە کردن هەڵسێ و پسپۆری خۆی واز لێ بهێنی ئەمە شتێکی نەگونجاوە هەر وەکو ئەوەیە کەوا یاسای کێشان ( قانون الجاذبية ) بە کاری یاسای خەست بوونەوە (قانون التكاثف) هەلسێ و هەروەها بە پێچەوانە یا یاسای تەنە سەر ئاوەکان ( قانون الاجسام الطافيه ) بە کاری موگناتیس هەڵسێ و هەروەها بە پێچەوانەوە ، یانی تێك دانی یاسای سروشتە پاشان شێواندنی هەموو کارەکانی تر جا ئەمە وەکو ووتمان شتێکی ..

چونکە ( ولن تجد لسنة الله تحويلا ) یاساکانی هاو سەرێتی و دایکایەتی دوو یاسای گیانی و دەروونین توانای جوانترین و

گرنگترین و پیرۆزترین شێوەی بوونی ژیان یان تیایە بەڵام ـ
کاتەش دا لە کارکردنیدەستو بازو و کارکردنیدەرەوە لارازن٠٠
لە ئافرەت دا مەمك شیر بە مناڵ ئەدات و منالٚ دان منال هەڵئەگرێت
و بۆ بوونی ژیان کار ئەکەن بەبێ ئەم دووانە ئادەمیزاد و
شارستانیەت نابێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە گوڕەپانی کار کردن
ئەبنە هۆی نە توانایی زۆر کار کە پێویستی بە چوستی و بازوو و
ئارامێکی زۆر هەیە پیاو بەبێ پسپۆری لە کارەکانی دا خاوەنی
مێشك و بیرە هەروەهاش ئافرەت ٠٠٠ ئافرەت ناتوانی بەکارەکانی
پیاو هەڵبسێ بەڵام پالپشتێکی بەتین و ئەستووره بۆ یارمەتی دانی و
حەسانەوەی لەدەردو ئازاری ڕۆژانەی ٠٠٠ پێغەمبەرەکان (د ٠ خ)
هەموویان پیاون چونکە کاری پێغەمبەرایەتی ئەیەوێ کەلەگەڵ هەموو
کەس و چینێکا هەڵس و دانیشتنی هەبێ و لەگەڵ چێشتنی زۆر
ئازارو ئەشکەنجەی وا کە چیا بەری ناگرێ ٠٠٠ پێغەمبەرەکان (د٠خ)
لە ڕەوشت و ئارامدا نەوەك لەئافرەت بەڵکو لە پیاوە کانیش لە نێرومێ
بەرزترن بەڵام لەو کاتەشدا هەر پێغەمبەرێك هەستی بەم خۆشیە
کردووە کە هاوسەرێکی ئافرەتی پالپشتی هەبووبێ ٠

هەروەکو (خەدیجە) خێزانی پێغەمبەر ( جێئارامگاو خەم
خۆری پێغەمبەر بوو لە زۆر شتا هەروەها ئەو سالەی کە خەدیجەی تیا
مرد پێغەمبەر ناوی ناسالی ( ناخۆشی و خەم ) ژئەو کاتەی مەککەیان
رزگارکرد یەکسەر پێغەمبەر پێش هەموو شتێك چووەسەردانی
گۆڕەکەی ٠٠٠

هەروەها دایکی ( عیسا ) سەلامی خوا لە هەر دوو کیان بێت هاورێی (عیسا) بوو لە زۆر شت یارمەتی داوە • لە جیهانی ئیمرۆدا ئافرەت وپیاو توانای هەموو کارێکیان هەیە ••• بەلاّم لەگەل ئەمەش دا لە گوێرەپانی مێشك و بیردا ••• رادەی پێش کەوتنی پیاو زیاترە لە کارەکانی دەرەوە دا ••• بۆی هەیە جار بەجار ئافرەتێ لە کاری پیاو وە پیاو لە کاری ئافرەت شتێك بزانێ وەبەکاری یەك هەلبسن بەلام هیچ کاتێك بەشێك یەکسان نی یە بەگشتی گەر ئەم رێرەوە بچەسپێ ئەوە ئەو ئەستێرەی تیمە لەسەریا ئەژین ئەویش بە پێچەوانە بسوورێتەوە تیمە و شارستانیەتەکەشمان وەکو پەرامووچە لە نێوان ئاسمان و زەمینەوە بخولێتەوە بەلاّم کەی ئافرەت بەدرێژایی سالەکان بەرێكوپێکی ئەتوانێ لەسەر کارەکەیان بن لەبەر هۆیەکانی [ حەیز و منال هەلگرتن نۆمانگ و منال بوون و ••• ماوەیەك پاش منال بوون تامێشك و تەندروستی گشتی ئەگەرێتەوە دۆخی جارانی خۆی ، ئەوە بەپێی ووتەی پزیشکەکانە ] •

لەهەر کارگەو دەزگایەك هەرمانگە چەند ئافرەت لەبەر ئەم هۆیانە داوای پشوودان دەکەن•••هەر بۆیەش بوو میری لە هەندێ وولات پشوودانی ئافرەتی منالبووی کردە شەش‌مانگ • باسە زانستیەکان ئاشکرایان کرد کەوا ئافرەت لە بارەی شێوە و لەشەوە زۆر لە پیاو جیاواز ترە تا ئەتومەکانی لەش جەوهەرەکانی بروتینێ

(الهیولینیه) بۆ خانەکانی شانەیی (خلایا النسیجیه) ئەو کاتەی ئافرەت ئەگاتە تەمەنی گەنجی جارجار (حەیز) بەخۆیەوە ئەبینێ کەکار ئەکاتە سەر هەموو ئەندامەکانی لەش هەروەکو زاناکانی ئەڵێن ئافـرەت لەماوەی ( حەیز ) دا ئەم گۆرانانەی بەسەرا دێت :ــ

١ ــ هێزی گـرتنی گـەرمایی لەلەش‌دا کـەم ئەبێت و پلـەی گەرمایی کەم ئەبێتەوە ••

٢ ــ لێدانی دڵی کەم ئەبێتەوە•••تەوژمی خوێن کەم ئەبێتەوە ژمارەیی خانەکانی کەم ئەبێتەوە ••

٣ ــ باری ( الغدد الصماء واللمفاویة واللوزتان ) ئەگۆرێت •

٤ ــ جیهازی هەرس باری ئەگۆرێ و هێزێ هەناسە لاواز ئەبێت•

٥ ــ کەم هەست و ئەندامەکانی لەش گران ئەبێت و کەم بیرو هێزی دەسەلاتی بەسەر بیر و هۆش‌دا ئەگۆرێ ئەم هـەموو کۆرپاناتە والـە ئافرەت ئەکات کەوا جیاوازی لە نیوان ساغی و نەخۆش خۆی ناکات هەرچەندە باری تەندروستی نالەبارە •

پزیشکی بەناوبانگ ( امیل نووك ) لەم بارەیەوە ئەڵێ ئافرەتان لە ماوەی حەیزدا ئەم ئازارانەی لێ دەرئەکەوێ وەك :ــ [ سەوئێشە ماندووبوون ، ئیسکە هێشان ، دەمار لاوازی ، دڵ تەنگی ، تێکچوونی باری میزڵدان ، تێك چوونی باری هەرس و پشانەوە ] •

هەروەها هەندێ پزیشکی تر لەبارەی منال بوونەوە ئەڵێن لە پاش ماوەی حەیز ناخۆشترین شت لەلای ئافرەت کاتی منال بوونە لەمنالّ دان یانی ئەو نۆمانگەی منالەکە لەسکی دایکیەتی - دکتور (ربریف) ئەڵێ :-

[ ئافرەت ناتوانێ لەوکاتە دا بەرگەی ماندووبوون بگرێت و هێزی ، بازوو کەم ئەبێتەوە لە ڕادە بەدەر .. لەم کاتەش‌دا پیر پلاوە تاچەند مانگێك کۆمەلە دەمارەکانی باریان ئەگۆڕێت هەموو رەگەزەکانی گیانی روو ئەکەنە شیوّان و شپرزەیی ] هەروەها زاناکانی پزیشکی لە باری ئافرەتی پاش منال بوونەوە ئەڵێن ئافرەت پاشی منالّ بوون زۆر جار تووشی زۆر نەخۆشی دەبێت .. هەروەها برینەکانی لەشی منال بوون ئامادەیە بۆتەشەنە کردن و هەموو ئەندامەکانی توخمی (جنس)ی ئافرەتەکە خەریکی گژبوونە بۆ گەڕانەوە بۆ دۆخی جارانی خوێ کە ئەوە بێ شك ئەبێتە هۆی گۆرانێك بەسەر لەشی ئافرەت ... یا هەندێ جار ئافرەتە کە نەخۆش ئەبێت و توانای کاری نابێت بە تایبەتی کاری گران ... لە کارگەکان ][1] .

ئەمە پەیێ‌ی بڕیاری زاناو پزیشکەکان کەسك پڕ بوون و منال‌بوون‌و حەیز کاریك ئەکاتە سەر ئافرەت هەر بۆیەش ئافرەتی بێ‌توانا لە کاری دەرەوەدا لە پێنوس داوە :-

(1) ٢٢٨ - ٢٣٥ لە کتێبی ( الحجاب ) ی المودودی وەرگیراوە .

أ ـ ئەوەی پەیوەندی بەتایبەتی یەکانی ( ژنایەتی ) یەوە هەیە وەك یاسای هاوسەریتی و دایکایەتی و زیرەکی هەست و سۆز نابێتە هۆیەکانی کارکردن لە دەرەوەی ماڵ •

ب ـ ئافرەت هەست و سۆز و دەروون و مێشکی لەگەل کارەکانی خۆیەوە بووەو گونجاوە بەکارهێنانی لە جێگایەکی تر ئەبێتە هۆی بۆ شایی یەکی دەروونی و هەستی هەر چەندە بەردەوام بێت لە کارەکەی دا ئایا نازانین کەوا چەند ناخۆشە یەکێك لە دەرەوەی پسپورایەتی کارەکانی خۆی کاربکات •

ج ـ هەروەکو ڕوونمان کردەوە لەپێشەوە ئافرەت تووشی تەنلاوازی بێهەستی ئەبێت بەهۆی ئەوکاربکەریانەی منال بوون و حەیزدا •

مامۆستا (عباس محمود العقاد) لە بارەی کاری ئافرەتەوە لەدەرەوە ئەڵێ [هەر لەسەر لە بەیانی مێژووەوە ئافرەت خاوەنی کاری چێشت لێنان و ئامادەکردن بووە هەر لەمناڵیەوە لەناو ماڵ و خێزانی حەز بە فێر بوونی ئەکات زۆر حەز بەچێشتی بەتام و خۆش ئەکات کە ئامادەی بکات بەڵام بە درێژایی ئەم ماوە درێژەی ئافرەت کاری لەم گۆڕەپانەوە کردووە گەر پیاوێك چەند ساڵێك خەریکی چێشت لێنان بێت ئەوا پێش هەموو ئافرەتێك ئەکەوێت ••• هەروەها پیشەسازی دوورمان و ڕەنگ ڕێژی ••• هەروەها ئافرەت حەز بەو جۆرە بڕین و دوورمانە ئەکات لەم سەردەمە کەوا پیاوەکان بەدی ئەهێنن لە

کارگەکانیان ][1] ئەوەی شایەنی باسە باشترین و ئازاترین چێشت کە لەچێشت خانەکانی ئەوروپا پیاون هەروەکو لە گرەوەکانیان بۆمان دەرئەکەوێ وەك باشترین جلدرووی ئافرەت و پیاو پیاوەکانن ... ئایامانای ئەوەنی‌یە هەست و مێشکی پیاو فراوانتر لەهی ئافرەت..؟!

ئافرەتەکانمان زیاتر بڕوا بەپزیشکی پیاو ئەکەن لە هی ئافرەت لەکاتی نەخۆشیەکانیان ... گەر لە شەرما نەبێت بۆمنال بوون و نەخۆشی ئافرەت هەمیشە ئەچنە لای پزیشکی پیاو ...

« سێهەم »

( ئیسلام و کارکردنی ئافرەت لە جیهانی کاری ژنایەتی و دایکایەتی‌دووشت هەیە کەوا پێویست بە دەرخستنی هەیە و لە کاتی باسەر کردنی کاری ئافرەت :ـ )

١ ـ لەراستیدا کارکردن بەهیچ جۆرێك حەرام و قەدەغە نی‌یە لە هیچ کەسێك بەمەرجێ بەهۆی ئەم کارکردنەیەوە تووشی گوناهکاری نەبێت ... ئافرەت هەر لەسەرەتایی مێژووە لەهەموو جێگایەك کاری کردووە . بەڵام دەسەڵاتی ئیسلام بەسەر کاری ئافرەت لە دەسەڵاتی سروشتەوەیە بەسەر کاری ئافرەت دا .. کاتێ عەلی کوڕی ئەبو طالب وفاطمەی خێزانی پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد کەهەریەکێکیان

(١) کتێبی ( ئافرەت و قورئان ) ی عەقاد .

ج کاریکی لەسەرە فەرمووی :ـ [ کاری دەرەوە بۆ عەلی‌یە ... کاری ناو مالیش بۆ فاطمە ] .

٢ ـ کاتێ خوا ئافرەتی بە ( مێ ) داناوە هەڵەی نەکردووە بەڵکو بە پێویستی خوا بۆ ئەنجام دانی ئەو کارانەی بەرژەوەندی و خێری ئادەمیزادی تیایە ... ماڵ جێگایەکی سروشتی‌یە بۆ ئەنجام دانی کاری ئافرەت هەروەکو خوای مەزن ئەفەرموێت :ـ

[ وقرن في بيوتكن ولا تبرجن تبرج الجاهلية الاولى ] هەروەها ( قورتوبی ) ئەڵێ [ ئافرەت گەر بۆ کارێکی زۆر پێویست نەبێ نابێ لە ماڵ بچێتە دەرەوە ][1] .

ئەمەش لە بۆ چوونی ڕاستی یاسا دایە :ـ

أ ـ کارکردن بۆ هەموو کەسە بەڵام بە مەرجێ لەسەر کارێکی بجوك کارێکی گرنگ و پێویستو و ئەرکی سەرشان فەرامۆش نەکرێت .

ب ـ ماڵ جێگایەکی سروشتیە بۆ ئەنجام دانی ویستەکانی گیانی و کۆمەڵایەتی کە ئافرەت پێویستی پێی هەیە ئافرەت بۆ پاریز گاری ناوو گیانی خۆی لە دەردە کۆمەڵایەتیەکان و حەز پەرستەگان بۆ کارێکی زۆر گرنگ نەبێت نابێ هەموو کاتێك لە بەردەمی چاو برسیەکان بلەرێتەوە .. ئافرەت ئەتوانێ لە کێلگە کار بکات

(١) ج ١٨ ل١٥٤ لە (جامع‌الاحكام‌القرآن)ی قورتوبی وەرگیراوە

دروێنە بکات خۆی کارەکانی خۆی بکات .. ئەتووانێ بچێت گوێ لە وتاری بەنرخ و لە کونگرەدا بەشداری بکات .. ئافرەت ئەتوانێ بڕیار بدات لە دادگا .. ئەتوانێ لەگەڵ سوپا بە شداری بکات ... بەکاری چێشت لێنان و برین پێچی و چارەسەرکردن هەڵبسێت هەروەکو ( ڕەبیعە کچی معوەز ) ئەڵێت :ـ [ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر (ص) تێ ئەکۆشاین و خەباتمان ئەکرد بۆ برین پێچی و گواستنەوەی بریندااران و شەهیدەکان بۆ مەدینە ][1] .

## کارکردن لە دەرەوەی ماڵ بۆ دەسکەوت

ئایا کارکردنی ئافرەت لە دەرەوەو جێ هێشتنی ( وولاتی سەربەخۆی ) خۆی چ زیانێك بەخێزان و کۆمەڵ ئەگەیەنێ :ـ

١ ـ خـوای گـەورە بوونی ئافرەتی لەماڵەوە بە دانـدەو مەڵبەندی گیانی و دەروونی ولەشی کـەسانی ناو ماڵ داناوە جا ئەگەر ئەو ئافرەتە بە درێژایی مانگان و ساڵان هەر لە بەیانیەوە لەماڵ بچێتە دەرەوە تا بەرەبەری ئێوارە چ مانایەکی ئارامگاو جێ نشینگا فاگەیەنێ هەموو خێزانەکە پێویستیان بەیەکێك هەیە لەماڵ بمینیتەوە بۆ ئەوەی ببێتە ئارامگاو جێ نشینگا بۆیان و ماڵەکە بەڕێوە بەات .

---

(١) بخاری و ئەحمەد ئەگێرنەوە .

٢ ـ کارکردنی ئافرەت بە درێژایی هەفتە و مانگ و ساڵان وای لێ ئەکات کەوا هەموو بیرو هۆشێکی لای کاری دەرەوەی بێت کە بەدرێژایی ڕۆژ لێی ڕا ئەبووێرێ ... هەموو بیرەکەی لای چۆنیەتی بەسەر بردنی ئەم ڕۆژە ڕۆژی داهاتوو و هەروەها ڕۆژێك درەنگ دێت ڕۆژێك لەگەڵ یەکێکی دائیرەکەی تێك ئەچێت وەیا لەگەڵ هاتوو چۆکەرانی ( مراجعین )ی دائیرەکە هەرا هەرای لێ پەیدا ئەبێ جا بەم هەموو ماندوو بوونی لەشی و دەروونی و مێشکی ئەگەڕێتەوە ماڵ ئایا ئەو ساتە ئەو بەسەزمانە ئەبێ کارێکی تریش بگرێتەوە دەست کە بەڕێوەبردنی ماڵ و خێزانە ئەوساتە ماڵ و خێزانەکە بەربادو وێران ئەبێت یا ڕۆژ بە ڕۆژ بیری لای ( پلەیەك ) زیاد کردنە لەکورسیەکەی یا زیاد کردنی نەختێ لە مووچەکەی ، بەم جۆرە هەموو هەستو بیرو هۆشێکی تێکەل ئەبێت لەگەڵ کارەکەیی و کە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە تەنها بۆ نەختێك حەسانەوەو خەوتنە وەکو میوانێکی میوانخانە پیاوەکەشی بەم جۆرە .. جا یا ئەبێ یەکێکی بیگانە بهێنن کاروباری ناوماڵ بەڕێوە ببات بەمانگانەیەکی زۆر بەقەد مانگانەی ئافرەتە خاوەن ماڵەکە لەدەرەوە ، یا ئەبێ چاوە ڕووانی جیا بوونەوەی هەموو خێزانەکە بکەن لە یەکتر .

٣ ـ لەم بەڕەڵلایی‌یەو چوونە دەرەوەی ئافرەت بۆ کارکردن، وولاتە ڕۆژئاوایی‌یەکان پێش ئێمە کەوتن‌و ئەو زیانانەی ئیسلام

لەم کارە دەست نیشانی کردبوو لێیان دەرکەوت •• ئافرەت لـە وولاتانی ڕۆژئاوا بەشی زۆری‌سەردەمی گەنجێتی‌خۆی لەپەیوەندی ( جنسی ) ی بێ‌جێ‌و بەسەر ئەبات پێش ئەوەی شوو بەکەسێك بکات •• وەهەر کاتێکیش شووی کردوو سکی بوو سەیری کـرد سکەکەی ڕێی گەڕان و چوونە دەرەوەی شەوان و ڕێی کاری لێ‌ئەگرێ سکەکەی لەناو ئەبات ، بەم جۆرە چەند کاری‌تر ناخۆشی لە نیـوان خۆیی‌و مێردەکـەی پەیـدا ئەبـێ و بـە جیـابوونەوە چیرۆکەکەیان دوایی دێت هـەربۆیەش ئیمرۆ لە ڕۆژئاوا ئەبینین کەم ئافـرەت چـەند ساڵیـك لای مێردەکـەی ئەمێنێتەوە یا لـە ماوەی چەند ساڵێکی کەم زیاتر لە چەند شووێك ئەکەن و بەرەلا ئەکرێـن •

## ( دووکێشە )

یەکەم :ـ دەربارەی مافی ئافرەت لەکار کردندا • هـەموو ئادەمیزاد ئەبێ ڕێگای ئەو کارەی بدرێت کەوا ئەرکی سەرشانیەتی و بەو ڕێگایەی ڕازەی گەل و کۆمەڵەکەی ئەکات ••• ئافرەتیش وەکو هەموو ئادەمیزادێکی سەربەست و ئازاد پێویستە ریگای ئەو کارکردنەی‌بدرێت کە ئەتوانێ بیکات و لە چوار چێوەی‌پسپۆرایەتی ژنایەتی خۆی بێت • وەکـو ووتمان کـارەکانی ئافرەت تایبەتین بەخۆیەوەو پیاو توانای‌ئەنجام دانی کارەکانی ئەوی نی‌یە بۆیەئەرکی

سەرشانیەتی کە خۆی ئەنجامی بدات ••• بەمە بەرزترین نموونەی خۆبەختمین نیشان ئەدات بەرامبەر گەل و کۆمەڵەکەی • ئافرەت مافی ئەوەی هەیە شوو بکات و ببێتە کەیبانوو لەماڵێکی سەربەست داو ببێ بەدایك و بەرێوەبەری ماڵومناڵ •• هیچ کەسێك نی‌یەو بۆی نی‌یە ئەم مافانەی لێ‌قەدەغە بکات و لەسەر دەزگاکانی میری پێویستە ئەنجام دانی ئەم مافانەی بۆ ئاسان بکات و پارێزگاری بکات بۆ بەرێوەبردنیان •• ئافرەت نابێ لەم مافانە واز بهێنێت وژێر دەستی یەکێکی‌تر بێت چوونکە ژنایەتی و دایکایەتی و بەڕێوە بەرایەتی ماڵ ئەرکی سەرشانی ئافرەتە و داوایەکی خواوەندی‌یەکە بەئەنجامی بگەیەنێت ••• نابێت لەبەر چەندکارێکی بچووك خۆی ژێر دەستی ئەم دەزگاو ئەم و ئەو بکات و رێگای بە ئەنجام دانی مافە راستەقینەکانی خۆی لێ بگیرێت هەروەکو پێغەمبەر ( د • خ ) ئەفەرموێ [ ماینبغی للمؤمن ان یذل نفسه ][1] ، وە ئەوەی شایەنی باسە تائێستاش لەمافەکانی دارایی و مافەکانی باری کەسأیەتی ( احوال الشخصیة ) و مافە سروشتیە کانی نەهاتووە ئافرەت ئەرکەکانی سەر شانی ڕاستەقینەی فەراموش بکات ( وەك ژنایەتی و دایکایەتی و بەریوەبەرایەتی منال ) •

لە یاساکانی ژیان و بناغەی شارستانیەت هاتووە کەهەر

(۱) لە ابن کثیر وەرگیراوە •

کارێکمان کرد بەرێك و پێکی بیکەین هەروەکو پێغەمبەری مەزن (ص) ئەفەرمووێ کەوا خوای گەورە باشی و چاکەی بەسەر هەموو شتێك نووسیوە :ـ

[ قد کتب الاحسان علی کل شیء ][1] هەروەها ئەفەرمووێ [ان اللەیحب اذا عمل احدکم عملا ان یتقنه][2] وکە گەریەکێ کارێکی کرد ئەبێ زۆر ووردی لێ بکات و بەباشی ئەنجامی بدات ، • •

زۆر لە دەزگاو کۆمپانیاکان کاری پیاو دراوەتە دەست ئافرەت لەوکاتەی ئافرەت کارێکی تری هەیەو بیری لێ ئەکاتەوە بۆی ئەچێ کاری پیاوێك ئەگرێتە دەست کە زۆر لێی زانایەو باشتر ئەتوانی بەئەنجامی بگەیەنێت • لە زۆر وولاتان کار بە ئافرەت کردن بۆتە مانەوەی زۆر لە پیاوان بەبێ کار ••• یا پیاوەکە کارێك ئەکات کەوا خۆی حەزی پێی ناکات ئەبێتە هۆی کەمتەرخەمی لە کارەکەی هەر لەوکاتەش ئافرەتەکە کەم تەرخەمی لەبەر ماندوو بوون وخەریکی بەکاری پیاوەوە••••لەم کاتەداهەردوکیان ابەر ماندووبوون و بەکاری پیاوەوە ••• لەم کاتەدا هەردوکیان کەمتەرخەم ئەبن و بەرهەمێکی وا وەدەست ناهێنن کەشایانی رێزلێ-نان بێت تەنها رۆژ بەسەر بردنە ••• خوای گەورە حەز بەکەم

(١) مسلم واحمد وترمذی وداود دەیگێڕنەوە •

(٢) بیهقی لە ( شعب الایمان ) دەیگێڕنەوە •

تەرخەمی ناکـات لـە کارەکـانمان داو وورد بینی نەکردن لـە کارەکانماندا بەکێشە و دەردە سەری کۆمەل و گەلاندا ئەنرێت..
تـا ئافرەت و پیاو هەریەکێك بەکاری راستەقینەی خۆی خـەریك نەبێت و بە ووردی بە ئەنجامی ئەگەیەنێت لەو کەسانە ئەژمێررێت کە بە ئەنقەست کەم تەرخەمی ئەکەن و تاوانێك بەرامبەر کۆمەل و گەلی خۆیان ئەکەن و شارستانیەت دوا ئەخەن .

دووەم :ــ ( پێویستی ڕێزلێنان لە پەیامی ئافرەت ). ئیسلام بۆ ئاسان کردنی ڕێگای ئافرەت بۆ بەدی هێنانی مافی خـۆی ڕاژەی گەل و کۆمەڵ هەوالێکی زۆری داوە و لەوپەڕی خۆبەخشین و مرۆڤایەتی‌یە .. ئافرەت لە مالی باوکیەتی بە خێو کـردنی لەسەر باوکیەتی و گەر خۆشی ناسی و گـەورە بوو هـەر دیسان لەسەر باوکیەتی ( وەکو کوڕنی‌یە کە گەورە بوو بەخێو کـردنی لەسەر باوکی نامێنێ ) .. هەر کە شووی کـرد بەخێو کـردنی لەسەر مێردەکەیەتی ئەگەر لەلای مێردەکەی نەمایەوە دیسان بەخێو کردنی دەگەڕێتەوە لای باوکی یابرای .. یاخرمەکانی دڕێژی نەدەینێ گەر کەس نەبوو بۆ ئاگاداری کردنی میری لـە سەریەتی بەخێوی بکـات و ڕێگـای ژیـانی بۆ ئاسان بکات بۆ ڕاژەی مرۆڤایەتی و شارستانیەت و توانایی بەرهەم هێنان و پەروەردە کردنی ڕۆلەی دوا ڕۆژ کە ڕاژەی گەلەکەی بکات پێش کەوتنی ئافرەت لەکارکردنی دانـی‌یە بەلکـو پێش‌کـەوتنی ڕاستەقینـەی ئافرەت پێش‌کـەوتنی

مـــرۆڤايەتـــی‌يە لـــە مەيـــدانی ڕۆشـــەنبيری‌و بـــەرزی ڕەوشـــت‌و دڵپاكيەتی ٠٠

ئەگەر سەيری دەرچوونی ئافرەت لەماڵەوە بكەين كەهەمو دائيرەو كۆمپانياكان دەڕوا دەبينين ئافرەت لەم كارەی‌دا كارەكانـــی پياو دەكات بەڵام كەسێك كاری تايبەتی ئەو (الامومة والتربية) تەواو ناكەن لەدوا ڕۆژ زيان بە كۆمەڵەكەی دەگەيەنێت چونكە دەبێتـــە كەمتەرخەمی لەكاری ڕاستەقينەی خۆی ٠

دەرچوونی ئافرەت لە ناوماڵ دەبێتە هۆی نەمانی خۆشەويستی و ميهرەبانی لە نێوان كەسانی ناو خێزانەكە ئەو خوشەويستی‌يەو ميهرەبانی‌يە گرنگترە لە ناو خێزان لە ئابووری زيان ٠

دايكـــی ڕۆشنبيرو ڕەوشت پاك نـــەوەی‌پاكـــی لێ‌دەكـــەوێتەوە هەروەكو ووتمان چۆن خێزانی ( عيمران ) نەوەی خۆی بە خوای خۆی بەخشی هـــەموو هێزيكـــی تەرخـــان‌كـــرد بۆپێ گەياندنی ڕۆڵەكەی بۆ ڕازەی مرۆڤايەتی وەك لە قورئانی پـــيرۆزدا خـــوای گەورە بە زمانی عيمران دەفەرموێت : [ رب اني نذرت لـــك مافي بطني محرراً ] خێزانی عيمران ئەوەی لە سكيا بوو ( مەريەم كچی عيمران ) بوو بۆ بەندايەتی خوای گـــەورەی تەرخان كـــرد لـــەو مەبەستەی‌دا تەنها لە خۆشەويستی بۆ خوای خۆی هيچ مەبەستێكی تری نەبوو جا لەو ئافرەتە ڕەوشت پاكە ( مەريەم و عيسا ) (د٠خ) پەيدا بوون كە جيهانی پڕ لە ڕۆناكی كرد ٠٠ ئايا خێزانی عيمران

ئافرەتێکی بێ بەرهەم بوو کە لەکارگەیەك کاری نەدەکرد ؟ ئـایـا پێگەیاندنی نەوەکانی بەشێکی گرنگ ناژمێردرێ بۆ پێش کەوتنی شارستانیـەت هـەرکەسێ دەیـەوێ ڕادەی بژێوی بەرزبێتـەوە نەختێکی‌تر ، مرۆڤ خۆرسك خۆویستە ، زیاتر چەندەها کـەس هاوسەری ناوێ گەرمانگانەی نەبێت یا چـەندەها باوکـان کچەکانیان دەخەنە کار بۆ بەرزی ڕادەی بژێویان ٠٠ بەڵام کەس بیر ناکاتەوە وە لە هاوسەرێکی ڕەوشت پاك کـە ڕۆڵەیەکی پاك و دڵێری لـێ دەرچێت کە ڕازەی گەل‌و کۆمەڵەکەی بکات ٠

ئافرەت پێویستە هەر بۆ خۆی کار نەکات بەڵکو بەرهەمـی مرۆڤایەتی زیـاد بکـات و بۆ پەروەردەکـردنی و پێگەیانـدنی ڕۆڵەکانی کاربکات و لە دواڕۆژ ببێتە نمونەی بەرزی جیهان وەکو ( خێزانی عیمران ) ٠

وەکو مامۆستا ( ئەنیس مەنسوور ) کـە یەکێکە لـە ڕۆژنامە نووسەکانی پێش کەوتنخواز دەڵێت : [ ئێمە سەیری خـۆ تەرخـان کردن بۆ ژیانی هاوسەرێتی دەکەین و بەکـاری دانانێین لەگـەڵ ئـەوەی لـە ڕاستـی دا کارێکـی کـۆمەڵایەتی‌یە و ئابـووری و پەروەردەیی‌و و دەروونی‌یە ، هەندێ لە وڵاتە ئورووپیەکان ڕۆژانە دەبڕنەوە بۆ ئـەو دایکـانەی لەماڵـەوە کاردەکـەن وەك لـــە (ئوستورالیا) ٠٠ زۆر پێ ناچێ کە دەبینین ئافرەت دوو دڵە یا دەبێ

کارکردن هەلبژێری یا منداڵ •• هەردەم لەلایەن ئافـرەت ویستی منداڵ ژاڵە و منداڵ هەڵدەبژێرێ ][1] •

بۆ رزگار کردنی مرۆڤایەتی دەبـی ڕێـزی پەیامی ئافـرەت بگرین و سامانی دەروونی و ناوەوەی لە سامانی هەستی پێویسترە بۆ ئادەمیزاد و بەختیاری کـەسان گرنگترە لە بەختیاریان بـە پول و پارە و سامان •

## مافی فەرمان بەرایەتی و کارکردن

لە پێشەوە باسمان کرد کەوا ئیسلام سەروکایەتی دەولەت لە ئافرەت قەدەغە ئەکات ••• چونکە نایەوێ بەهیچ جورێ ئافـرەت توشی باری ڕامیاری سەرگەردانی ئـەم جیهانە بێت و ببێتە بنێشتە خۆشەی سەرزمانان و پیاوانی پارتە رامیاریەکان چۆنیان بوێ وای پێش خویانی بدەن و وەپاشی بدەن ••• ئیسلام ئافرەت لە کار و کاسبی قەدەغە ناکات بەمەرجێ ئەم کارە نەبێتەتێك دانـی خێزان و نەبێتە هوی بچرانی پەیوەندی نێـوان ژن و مـێردو نەبێتە هـوی فەراموش کردنی ماڵ و منال و دایکایەتی کە دایك بۆی دروست بوە • لە زۆر لە وولاتـە پاش کـەوتوەکانی کـە زۆر لە ئافـرەتانی لە داو و دەزگاکانـی ئەبن بەفەرمانبـەرو •• ڕێگای پیـاو ئەگـرن بۆ کارکردن جێگای پیاو دەگـرنەوە ژیانـی خێزان داری و ماڵو

(١) رۆژنامەی الاخبار المصرية لەژێر ناوی الموافف •

منـال فەراموش ئەكـەن نـەی باشە كـێ بـە كاروبـاری خێزان هەلبسێو كێڕۆلی دایكایەتی بێنی كە كـەس لـە ئافـرەت باشتر پسپوری لێ نـی‌یە : جگـە لەوەی چـەندەها پەیوەنـدی نابەجـێو بەدرەوشتی لە نێوان كەسانی دەزگاو دایرەكان پەیدا دەبێ ئەبێتە هوی پچرانی ژیانی خێزان و شلەژانی باری ژیانی منالان و چەندەها جار بیستومانە ئافرەتێك لە فلانە دەزگـا دوای پیاوێكـی فـەرمان بـەر كەوتود لە هەمان دایرە چەند منالی دوای خـوی بەجـێ هێشتوە ئەمەش راستە و بیستومانە بەلێ‌ئەوانەی‌حەز ئەكەن ئافرەت كاربكات بەرهەم زیـاد بكـات با ئافـرەت دا بمەزرێنن لە خـەستەخانەكان و بیانوویان پێ‌نەگرن‌و قسەی ناشرینیان بۆ هەلنەبەستن یا لە كـاری پزیشكی‌و برین سـازی و فێركـردنی منـدالان وانـە ووتنـەوەی ئامادەیی‌یەكان و چەندەها دەزگاو دایرەی تركـە ئافرەت پسپۆری تیا هـەیە وەك باخچـەی ساوایان و بەخێوگاكـان و دەزگاكانی ئاگاداری كردنی كۆمەلایەتی (الرعاية الاجتماعية) و ئەو كارگانەی كە هەموو كرێكارەكانی ئافرەتن وەك چنین و دروست كـردنی مافوورو شتی تر .

بە كورتی ئیسلام رێ نادات ژیانی چەندەها مروڤی دوا ڕۆژ فەراموش بكـرێت‌و بشلەژێ لـە پێناوی دروست‌كـردنی پاكەتێـك جگەرەو نووسینەوەی چەند لاپەڕەیەك لە بەیانی تا ئێوارە .

لەفەلسەفەی ئیسلامدا وەکو رۆنمان کردەوە ئیسلام نایەوێ لەوکاتەی ئافرەت ئارەقەی ماندو بوون بەکاروپیشەی ناومالو پەروەردەکردنی مندالو هەستو نەستی دایکایەتی دەرێژێت •• کارێکی تری پێبکرێت یاوای لێبێت گەر کار نەکات لەبرسا بمرێت و یا کاری نابەجێ بکات بۆ ئەوەی بژیت ••• ئافرەت تالەمالی باوکیەتی لەسەر باوکو برایەتی ئاگاداری بن و نەهێلن لەهیچی کەم بێت بۆ لەگەل دایکیا خەریکی فێربوونی هەنەری ناومالو مالداری و دایکایەتی و پەروەردەی نەبێت هەر وەك قوتابی یەك کە میری بەخێوی ئەکاتو یارمەتی ئەدات تا لە دانیشگا دەرئەچێت •• کچیش وایە تا مێرد (شوئەکاتو) دەبێتە بەرێوەبەرێکی کارزانی ناومال •• قولو باسکی لێ هەل ئەکات بۆ گەورەترین و پیروزترین کاری مرۆڤایەتی ئەویش کاری پەروەردەیی دایکاتی‌یە کە بریتیە لە خۆبەخت کردنو کۆل نەدانو سەربەرزی دواڕۆژ •• جا ئەوساتەی ئەو دایکە دلسۆزە بەرهەمی ڕەنجی سالانی خوی ئەبینێت چەندە دلخوشە کە ئەبینێ کوڕێکی فەرمانبەرەو یەکێکی سەربازەو یەکێك ئەندازیارەو کچێکی پزیشکەو ئەوی تر فێرکەرەو ئەوەی تریان وانەبێژە ئێمە دژی فەلسەفەی روژئاواین کە ئەلێ هەرکاتێ کچ تەمەنی حەفدەسال ئەبێ خۆی خۆی بە خێو بکات بە هەر جۆرێك بێت باکیان نی‌یە پاش ماوەیەك ئەم کچە

ئەکەوێتە گۆمی تاوان‌و بەدرەوشتی باکیانی‌یە گەر ئەم کچە فێری شتێك دەبێت یانا یا لەدوارۆژا ئەبێ بەدایك یانا ، منالی چاکی دەبێ یانا یا منالێکی خراپی ئەبێ لە پیاوێکی بێگانەی کە تەنها یەك سات لای بووە ڕەنگە ناویشی نەزانێ زور لە ئافرەتانی ئیمڕۆ ئەلێن ئێمە کارئەکەین بۆ ئەوەی بونمان بسەلمێنین و هەست بە مرۆڤایەتیمان بکەین ئێمەش بۆ وێنە هەروەکو لەپێشـــا ووتمان ئەلێین :ــ ئایا ئەوکەسانەی بە دەستی خویان کار ناکەن‌و تەنها بەمێشکیان نەبێـت ئەوانە هەست بەمرۆڤایەتی ناکەن ؟ ئایا سەرباز کە نابێ هیچ کارێك لە دەرەوە بکات هەست بەمروڤایەتی ناکات ؟ ئایا کاری دایك لە هـی سەربازو هەموو روشنبیرێك گرنگ‌ترو گرانتر نی‌یە ؟ یا هەندێ ئافرەتی‌تر هـەن ئەلێن ( کـار ئەکەین تا خـۆمان تەخەینە کولی باوکم یامێردم خۆم خۆم ئەژێنم ) ئێمەش ئەلێین :

تاکچ لەمالی باوکی بێت‌و لەگـەل دایکیا کـاربکات و خـەریکی فێربون بێت نەوەك پێویستە بەلکو ئەرکی سەرشانیەتی بەخێـوی بکات هەروەکو قوتابی دانشگا ۰ لەو کاتەی ئافرەت دەوری دایکێتی لەمالی مێردی ئەبینێ ئەرکی سەرشانی مێردەکەیەتی بەرامبەر ئـەو ئەرکە گرانەی ئافرەت لەمالەوە ئەیکات ئەویش لە دەرەوە بکات و مال و منالەکەی بژێنێت ۰۰ باشە بۆچـی فەرمانبەر یا کرێکار یـا سەرباز نالێ بۆچـی من خۆم بکـەمە کۆلی مێری‌و بەخێـوم بکات

مووچەم بداتێ ؟! هەروەکو وتمان ئەو پیاوانەی حەز دەکەن ژنی خاوەن منداڵ لە دەرەوە کار بکات بە جۆرێکی ناپاکانە سەیری ئافرەت ئەکەن ئەیانەوێ ئافرەت بەئاسانترین ڕێگە دەست گیر بکەن لەو کاتەی کچ لە ئافرەتی خاوەن مێرد کەمتر گیرودە ئەبێ یا ئەو ئافرەتانەی خاوەن ماڵومناڵن‌و لە هیچیان کەم نی‌یەو حەز بەکاری دەرەوە ئەکەن ئەیانەوێ هەوای بگۆڕن‌و جیاوازیەکانی نێوان مێردیان و پیاوانی تربدوزنەوە هەروەکو ( جیوم فریرو ) لێ کۆلەری بەناو بانگ لە کاروباری ئادەمیزاد لە ( گوڤاری گوڤارەکان ) ی ژمارە ۱۸ دائەلێ :ـ

لە ئوروپا ئەو ئافرەتانەی کاری پیاوان ئەکەن‌و مێردناکەن‌و بەرۆلی دایکێتی هەڵناستن ئێمە ئەتوانین ئەوانە ناو بنێین ڕەگەزی سێیەم یانی نەپیاون نەئافرەت کچە نوسەری بەناوبانگ ( ئانی رورو ) لە ووتارێك کە لە رۆژنامەی ( ئاسترنفین ) ی‌ژمارە(۱۰)دا بڵاوی کردەوە ئەڵێ :ـ ئەوکاتە کچەکانمان لەماڵان کاریان ئەکرد باشترە لەو کارەی کەلە کارگەکان کار ئەکەن ئەکەونە گێژمی خوێناوی بەدرەوشتی و تاوان ... خوزگەو وولاتی ئێمە وەکو وولاتانی ئیسلام ئەبو کە ئافرەت لەوپەڕی پاکیو سەربەرزیی ئەژیت و وەکو بەندە و کارەکەو سەیریان ناکرێت و وەکو نەوەی ناوماڵ سەیریان ئەکرێت بەڵێ

شورەیی بۆ وولاتی ئینگلیزە کـە کچەکانمان تائەزنۆ لـە چلپاوی کوناهن تێکەڵاویان لەگەل پیاوان و دوورکەوتنەوە یـان لەمـاڵو ماڵداری و خێزان هەروەها ( جول سیمون ) فەیلەسوفی ئابوری لـە یەکێ لە گۆڤارەکانی فەرەنسا دا ئەلێ :ــ ئافرەت لەکار گەدا کاری کرێکارێك ئەنجام ئەدا بەڵام ناتوانێ کـاری ئافـرەتێك دایکێـك ئەنجام بدا •

فەیلەسوفی هاوچەرخ « برتراندرسل» ئەلێ :ــ « بەکار کردنی ئافرەت لە هەموکارێك کـاروباری خێزان تێـك چـوو ، لەتاقی کردنەوەدا دەرکەوت کە ئافرەت نەفرەت لە خوورەوشت و ڕەفتاری ئەم سەردەمە ئەکات و حەز ئەکات دلپاك‌و دڵسۆزی‌یەك پیاو بێت‌گەر سەربەست بو لە باری ئابوریدا » هەروەها « خاتوو سەلما ئەلمەفار ئەل کزبری » کە یەکێکەلە سەرۆکانی بزوتنەوەی ئافرەتان لـە نیشتمانی عەرەبی باش گەڕانەوەی لە ئەمریکا لە ووتارێکا کە لە ڕۆژنامەی (الایام) ی ئەیلولی ١٩٦٢ بلاوی کردەوە تیادا ئەلێت :ــ « ئـەو کەسانەی سەر لە ئەمریکا ئەدەن سەیر ئەکەن کە ئەمریکیەکـان هەر لە سەرەتاوە منالەکانیان فێری یاری کردن ئەکەن بەمەکینەو پالەوان‌بازی ئافرەتەکانیشیان‌کاری‌پیاوان ئەنجام ئەدەن لە کارگەکانی ئوتوموبیل و دروست کردن و خاوێن کردنەوەی ڕێگاوبان •

ئای چەند ئازار ئەخوم کاتێ ئەو ئازارو ئەشکەنجەی ئافرەتی ڕوژئاوا ئەبینم کەتیایدا ئەژیت‌و هەموژیانی گەنجایەتی خۆیان لە کارێك بە فیڕو ئەدەن کە هیچ پەیوەندی بەژنایەتی و دایکایەتی‌یەوە نی‌یە ، هەروەها دکتورة ( ئیدائیلین ) کە پسپۆرێکی ئەمریکیە لە ڕوژنامەی ( ئەلاَیفنینگ ستاندارد ) ووتارێکی بلاَو کردەوە تیایدا ئەلێ :- زورترین هۆیەکانی ئاژاوەی ناو خێزانی ئەمریکی‌و نەهێنی ئەو تاوانە زورانەی لەناو کومەل روئەدا ئەوەیە کەوا ئافرەت لە مالداری وازی هێناو مال و منداڵی خوی بەجێ هێشت‌و بۆ ئەوەی بوجەی خێزان بەرز بێتەوە ... بەڵێ بەنجەی خێزان بەرزبۆوە بەلاَم ڕادەی ڕەوشت کەم بوەو بۆ ئەوەی ڕەوشت بگەڕێتەوە بو کۆمەڵەکەمان و منالەکانی گەڕانەوەی ئافرەت بو مالەوەی نەوەی نوێ لە ئاژاوەی دەروونی و دەردەسەری روژانە ڕزگاو ئەکات هەروەها یاکاتێ ئەندامەکانی کۆنگرێسی ئەمریکی کۆ بونەوە بۆ لێکولینەوە لەکێشەی قەدەغە کردنی ئەودایکەی منالی هەیە لە کارکردن یەکێك لە ئەندامەکان ووتی :- کارکردنی دایك ئەبێتە هوی کارەساتی کومەلاَیەتی‌و ئابوری زۆر .. یەکێکی ترووتی ئەوساتەی خوا ئافرەتی دروست کرد ئەو توانایەی پێدا کە منالی ببێ‌و پێی نەووتوە کاربکات‌و لەدەرەوە منالەکانی جێ بهێلیت . ئەندامی

سێیەم وتی :- بەڵێ ئافرەت ئەتوانێ ڕازەی وولات بکات گەر لەماڵەوە مایەوە کە ێناغەی خێزان و ماڵداریێتە ئەبەدانی چوارەم وتی :- ئەبێ بڕیارێکی پەلە بدرێ بۆ قەدەغەکردنی ئەو دایکانەی منالەکانیان لە هەشت ساڵ بچوکترن • هی پێنجەم وتی :- دایك وەکو (ڤیتامین) • گەرمنالەکانی لێی بێبەش بون نەخوش دەکەون و ئەمرن •

دوای لە سەر ئەمە ڕێك کەوتن ئافرەت فێری خوێندەواری بکەن تالە پاشەڕوژدا سوودی بۆ منالەکانی هەبێت و کارکردنیان قەدەغە کرد ئەگەر چی بڕیارەکانیان هەر لە سەر کاغەزەمایەوە سك پڕ بونی ئافرەت یەکێکە لە کێشە هەرە گرنگەکانی تەندروستی لە کارگەکانی پیشەسازی ڕوژئاوا ئافرەتە کرێکارەکانی ئەمریکا ژمارەیان دەگاتە (٣٠ ملیون) کرێکار زیاتر لە نیوەیان شویان کردوەو بەشێ زوریان هاتوو چویەکی چالاکانەی کارگەکانیان ناکەن لەبەر باری تەندروستی نارێکیان چونکە ڕادەی سك لەبەر چون تادێت لەناو یانا بەرز ئەبێتەوە نارێکی هاتنیان بۆ کارگەکان دەگەڕێتەوە بۆ منداڵبوونیان یانزیك بونەوەیان لەمنال بون یا لەبەر ئەمەی سکەکەیان لە ناو بردوە و تەندروستی یان تێك چوە••زور جار وا ئەبێ زور لە کارگەکان بڕیاری دەرکردنی هەرئافرەتێك ئەدەن هەر کاتێ نیشانەی سك پڕ بوونی لێ دەرکەوت جا ئەم ئافرەتە یا ئەبێ کارەکەی جێ بهێلێ یا ئەبێ سکەکەی لە ناو بات و ئەو منالەی بە

درێژای تەمەنی چاوەڕوانیەتی لە ناوی بیات • ڕاپۆرتێکی وەزارەتی ناوخۆی بەریتانیا ئەڵێ :

ڕادەی ئافرەتە چەتەکان بەرزبوونەوەو ئەمن و ئاسایش لە وولاتدا تێك ئەدەن تەنها لە ساڵی ١٩٦٠ دا (٧٤٢) هەزار ئافرەت و کچ دەست بەست کران بە هۆی دزی کردن و هێرشی ناڕەوا بۆ سەرکەل و پەلی خەلك دەهەزار کچ کە تەمەنیان لە بیست ساڵ کەمترە گیراون بەهۆی بەدرەوشتی و کاری ناڕەوای شەوانە •

گەر سەیری سیمای گشتی ئافرەت بکەین ئەبینین بەشی نیوەی سەرەوەی لەش کێشی لەخوارەوە زیاترەو ئەم وێنە بەرین و قوڵەی لە بۆشایی سکیدا هەیەو وێنەی تایبەتی منالّ دان ئەم وێنە بەرین و قولەی لە بۆشایی سکیدا هەیەو وێنەی تایبەتی منالّ دان ( الحوض)ی ئافرەتەکە تایبەتە بۆ سك کردن ، ئەم هەموو جۆرە وێنە تایبەتیانەی ئافرەت گۆڕانێکی گرنگ لەکێشی ئافرەت پەیدا ئەکات جگە لەو گۆڕانەی دێتە سەر لەش و دەروونی ئافرەت لە کاتی سك پڕبوون و منال بوون دا ئەم هەموو شتانەوا لە ئافرەت ئەکات کە زۆر بە توانا خۆی را گرێت بەرامبەر ئەو کارانەی ئەیکات ••• هێزی کارکردنی جیهازی سووری هەناسەدانی ئافرەت لەکاتی کار کردنێکی زۆر کەم ئەبێت ، کار ئەکاتە سەرهەموو ئەندامەکانی لەش و کەم بوونی ڕادەی ئۆکسجین لە خوێندا •

جگەلەوە ئافرەت دروست نەکراوە بۆ کاری گرانی درێژ خایەن لە بەرامبەر ئەوە ئافرەت ووردبین ترە لە پیاو لە کارکردنا جا پێویستە ئافرەت لەکارە ووردەکانا بەشداری بکات و پیاویش لەو کارانەی کە بەهێزی بازوو ئەنجام ئەدری[1] •

## نەخۆشیەکانی ئافرەت لەکارکردندا

گوڤاری ( دەکستیل بەکلا دونگ Textl Bexliding

)کەلە شاری Duseldruf ی ئەلەمانیای رۆژئاوا دەرئەچێ لــە ووتارێکـــی بــرۆفسۆر Kline ی سەرۆکی پزیشکانی نەخۆشخانەی میری ئافرەتانی شاری Ludwix Haven بلاوکردەوە کە لە کونگرەی پزیشکانا باسی کاری ئافرەت ئەکاو ئەو نەخۆشیانەی تووش دەبێ بەهۆی جۆری کارکردنیەوە •• ئەڵێ:ـ رۆژی چەندەها ئافرەت رووئەکاتە (عیادە) کەم داوام لێئەکا یارمەتی بدەم بەهۆی ئەم ئازارانەی لەئەنجامی کارەکانی تووشی دێت •• چونکە ئافرەت جگە لە پەروەردەکردنی مال و منال کــە کارێکــی

---

(١) گوڤاری شارستانیەتی ئیسلام بەرگی دووەم لاپەرە ٤٥٥ لە ووتاریک بە ناوی ( الحمل الامهات ) وەرگیراوە کە ( هانس کــیرهوفا ) نوسیوویە و دەتوفیق طیب وەریگــیراوە بـــۆ عەرەبی •

ئاسان نی‌یە ڕوو بە ڕووی کارێکی تر دێت کە کاری دەرەوەیە چ لە دایرە چ لە کارگە جگە لەوانە ئافرەت هەموو کات روو بە رووی باڵەپەستۆی دەماری ئەبێ بەهۆی ئەو بارانەی لەش و گیانی کەمەڵی ئەگرێت.هەروەها ئەڵێ :ـ لەم دوایی‌یەدا ئافرەتێك هاتەهاتە لام و ئەی ووت:ـ[لە کاتی کارکردنمدا (لەکارگەیەکی جلوبەرگ دروین ) دەرزی ماکینەکەم ئەکەم بەپەنجەما رۆژی چەندەها جار بەبێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت ... یا کتوپڕ بەسەر مەکینەکەم ئەکەوم و لە هۆش خۆم ئەچم ] .

بەڵێ ئەوەو چەندەها ئافرەتە کرێکارەکانی تر تووشی ئەم جورە شتانە ئەبن بەهۆی ئەنجامی کارەکانی یەوە چونکە ئافرەتێك ئەگە کار لە دەرەوە بکات ئەبێ بەیانیان کات ژمێر پێنجی بەیانی لە خەوهەڵسێت و منالەکانی بۆ خوێندگا بەرێ بکات و لە پاشا نیوسەعاتێك لەسەر پێ بڕوات و جگە لە پالەپەستۆی ناو پاسەکان تا ئەگاتە جێگای کارکردنەکەی لەپاشان هەشت سەعات بەدیار کارەکەیەوە بێت ئایا ئەمە چ حەسانەوەیەکە بۆ ئافرەت بەتایبەتی گەر ئەم ئافرەتە سکی پڕبێت . هەروەها لەو سەر ژمێرە پزیشکیەی کەلە ئەلمانیا کرا نیشان‌ئەدا کەوا لەسەر هەشت ئافرەت یەکێك تووشی نەخۆشی دل‌و جیهازی سووری خوێن ئەبێت ... ڕاپۆرتی پزیشکەکان ئەمە ئەخاتە پاڵ ئەو بارە گرانانەی

که ئافرەت پێ هەڵئەستێ .. جگە لەوەی کەوا ژمارەی ئەو
ئافرەتانەی نەخۆشی سەریەشەی درێژ خایەنیان هەیە حەوت
ئەوەندەی ئەو ئافرەتانەیە کە تەنها کابانی ماڵەوەن .. جگە لەو
نەخۆشیانەی بەهۆی مردنی منالو لەبەر چوونی منال
تووشی ئەبێت . پراوەستانی زۆرو دانیشتنی زۆر لە سەر کورسی
یاخود چەمانەوە بەسەر مێزی کارکردن یاهەلگرتنی شتی گران
ئەمانە هەمووی لەگەڵ سایکلوجیەت و چۆنیەتی بیاری ئافرەت
ناگونجێ ... نەخۆشیەکانی ئافرەت وەکو :ـ ئەستوور بوونی
قاچەکانی و هەڵئاوسانی سكو هەندێ نەخۆشیتر کە ئەگەرێتەوە
سەر ئەو بارە دەروونیانە کەلەمێشك و (النخاع الشوكي) وەدێت
کە لە دوایی‌دا ئەبێتە هۆی تووش بوونی وەستانی کاری
دەمارەکان ... ئەبێ بپرسین ئافرەت بۆچ لە دەرەوە کارئەکات ؟!
ئەگەر ئەوە چارەنووسی ئافرەت بێت ئایا تەندروستی سەری هەموو
شتێك نی‌یە ... ئایا زۆر بوونی سامان لە ژیان هەموو شتێکە
ئادەمیزاد هەرچەند دەستی کەوێت هەربە دوای‌دا ئەگەرێت تا
ئاوی گەرم بخواتەوە هەر تینووتر ئەبێت گوڤاری ( شارستانیەتی
ئیسلام ) لە ژمارە (٣)ی بەرگی سێ لاپەرە (٣٣١) دائەڵێ :ـ ئەو
کەسەی لە باری خۆ کوشتنی ( مارلین مۆنرۆ ) ئەکتەرو شاژنی
سینەمای سەردەمی خۆی ] ئەکۆڵیەوە نامەیەکی پارێزراوی

لەسەنووقی سپیراوەکانی ( صندوق الامانات ) لە مانهاتن بانگ لە نیویورك دۆزرایەوە کە ئەم نامەیە لایەنێکی خۆ کوشتنی ( مونرۆ ) ی ڕوون کردەوە کەلە سەر زەرفەکە نووسرا بوو ( پێش ئەوەی بمرم نامەکەم مەکەنەوە ) کا تێ لێکۆڵەرەوە کە نامەکەی کردەوە سەیری کرد بەدەست خەتی ( مونرۆ ) خۆی نووسرابوو :ـ [ لە ناوبانگی خۆت بپارێزە ••• خۆت بپارێزە لەوانەی بە دەرخستنت لە خشتەت ئەبەن من چارە ڕەش ترین ئافرەتی ڕووی زەمینم ••• نەم توانی ببم بەدایك •• من ئافرەتێکم حەزم لە ماڵداری ئەکرد ••• ژیانی خێزانداری پاك سەری هەموو شتێکە ••• بەختیاری راستی ئافرەت لە ژیانی خێزان داری و مالداری پاك و خاوێنە وە یە •• ژیانی ناو ماڵ و خێزان ڕەمزوهێمای بەختیاری ئافرەتە هی مرۆڤە ] وە لە دوای نامەکە دائەڵێ :ـ [ هەموو خەلك زۆرداریان لێکردم ••• کار کردن لە سینەما وا لە ئافرەت ئەکات کە ببێتە کەلوپەلێکی هەرزانی بێ نرخ هەر چەند لەو پەری ( نەمری و ناوبانگی بەدرۆ ) دا بژیت وە من داواو ئامۆژگاری لە هەموو کچێك ئەکەم کە نەبێ بەئەکتەر و کار لە سینەما نەکات خۆیان نەخەنە بەردەستی بازرگانەکان • • چونکە لە کوتایی وەکو منیان بەسەر دێت ] • •

# هۆی چوونە دەرەوەی ئافرەت لە ماڵوکێشەی هاوسەرایەتی

لە ڕاپۆرتێکی دکتور Kngel مامۆستای نەخۆشخانەی دانشگا

بەشی نەخۆشیەکانی دەمارەکان دەروونی لە( ڤیەننا )کە لەگۆڤارێکی جیهانی پزیشکتی بـلاوی کـردەوە ئەڵێ :ـ « هەر ساڵێـك لـە نەخۆشخانەی ئێمـە ١٠٤ کارەساتی خۆکوشتن تۆمار ئەکـرێ وەلای ئێمە ئەزانرێ کەوا ئافرەتان زیاتر خۆیان ئەکوژن هەروەها هەولدان بۆ خۆکوشتن لەناو گەنجەکانا ژمارەیەکی ترسناك نیشانئەدا کەلە هەر نۆ ڕۆژ شەش کەس خۆیان ئەکوژن ... تەنها لە یانزە مانگ ١٣٦ کچۆلە خۆیان لە ناو برد وە گرنکترین هۆیەکانی خۆ کوشتنی ئەم کچۆلانە یا ئەم گەنجانە ئەوەیە :ـ

کچەکان لە ژیانی ڕۆژانەیان زۆر پرسیاریان دێتـە پێش و هەوڵ ئەدەن ئەم پرسیارانە شیکار بکەنەوە بەڵام کـچ ئـەم جۆرە پرسیارانە کە پەیوەندی بە ژیانی خۆیەتی بۆ دایکی نەیێ بۆ کەسی هەڵنارێژێ جا لەبەر ئەوەی بەدەگمەن گەر ڕێ بکەوێ ئەگینا چاوی بەدایکی ناکەوێ منالەکان کاتێ ئەگەنە رادەیەك هەست ئەکەن بەبوونیان .. کارەساتێکی زۆر گەورەیان دێتە پێش و کاتێ هەست ئەکەن باوکیان ناناسن و دیار نی‌یە جا چ لە بەر ئـەوەی باوکیـان لەمەیدانی جەنگە یا دایك و باوکی لەیەك جیابوونەتەوە یا باوکـی

ڕاستەقینەی هەرنییە ... جا منالێك کە بنکەی ژیانی تێك چوو کە خێزانە ئەبێ چی بکات هەست بە بۆشایی یەکی زۆریان و بەرین ئەکات لە دەروونیا لە گیانیا جا لە بچووك ترین کوسپ و تەگەرەی ژیان بیر لە خۆ لە ناو بردن ئەکاتەوە .

کاتێ گەنجێك لە خۆکوشتن رزگار ئەکەیت و پێی ئەڵێی : بۆ خۆت ئەکوژی دایك و باوکت دلیان بۆت ئەسووتێ ؟! ئەمیش لەوەڵاما ئەڵێ :- بۆچ من دایك و باوکم هەیە تا دڵیان بۆم بسووتێ من لە بۆشایی بوومەو بەرەو بۆشایی ئەگەڕێمەوە : .

بەڵێ موسولمانی بەرێز ئەم وێنەیە بەسە بۆ ئەوەی بزانین تاچ رادەیەك یەك نەگرتنی خێزان کار ئەکاتە سەر منالەکانیان ئەو کێشەی ئەکەوێتە نێوان دایك و باوك و دەبێتە هۆی چوونە دەرەوەیان ئەبێتە هۆی بەرەڵلا بوونی منالەکانیان .

## ( ئافرەت و .. مافی ڕامیاری )

لە مێژووی ئیسلامی پیرۆزەوە بە تایبەتی لە سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) و خەلیفەکانی دوای ئەو نەزانراوە ئافرەت کە بەشداری دەسەلات داریتی و پاساداناان و شەڕ و شۆڕو کۆبوونەوەکانی پێغەمبەر و یارانی کرد بێت ..

هەر چەندە ئاینی ئیسلام بایەخێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری زۆری بە ئافرەت داوەو هیچ جیای ناکاتەوە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکی

تر بەڵام لە گەڵ ئەوەش بە شداری باری ڕامیاری سەردەمی پێغەمبەرو یاوانیان نەکردووە تەنها ئەوە نەبێ هەندێ جار لەگەڵ لەشکری ئیسلام دا ئەچوونە دەرەوە بۆ برین پێچی و ئاودان بە تینوان و هەروەکو ( ڕەفیدە ) خێمە یەکی دانا بوو برینداری تیمار ئەکردن •

ئافرەتانی سەردەمی پەیدا بوونی ئیسلامەوە جوانترین و پیرۆز ترین خۆبەخت کردنیان نیشان دا بۆ بەرز کردنەوەی ئالایی ئیسلامەتی وەکو ( دایکی عەممار ) خوشکی عومەری کوری خەتتاب و ئەسمای کچی ئەبو بەکرو زۆری تر ••• بەلام ئەوە ناگەیەنێ کەئەوانە لە باری رامیاری و یاسا دانانی سەردەمی ئەوان بە شداریان کردووە وە هیچ ئافرەتێك سەر لەشکری نەکردووە تەنها دایکی موسلمانان ( عائشە ) نەبێ بەسواری ووشترەوە بە ناوبانگ ترین شەری کردووە لەگەل ئەوەشی ئەو سەرکردەی لەشکربوو ••• بەلام لەسواری کەژاوەکەی و لەپشت پەردەوەهانی هاوەڵەکانی ئەدا پاش شەڕێکی خوێناوی ( عائشە ) لەم کردارەی زۆر پەشیمان بۆوەو خێزانەکانی تری پێغەمبەر کەمابوون لەسەر ئەم کارەی زۆر نارەزایان دژی دەربری و ئەویش داوای لە خوای گەورە کرد کەبی بەخشێت و دوای شەرەکە ( عەلی کوری ئەبوتالیب ) کە سەرکردەکەی لایەکەی تری شەڕ بوو بەچاوێکی پڕ لە رێزو بەرزییەوە لەگەڵ پاسەوانی کردنێکی تەواو گەیاندیەوە

مەدینە ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەیاسای ئیسلام ڕێگای ئافرەتی داوە بۆ دەست لەکاری رامیاری بدات بەڵکو عائشە خۆی دانی بەم هەڵەیەنا :ـ هەر چەندە ئافرەت سەردەمێك لەسەردەمەکانی ئیسلامدا بەشداری کردووە لە پاشایەتی و دەسەلات داریتی وەك ( شجرة الدر ، زبیدەی ژنی هارونەرەشید ) کە دەسەلاتێکی زۆری بە سەر مێردەکەیا هەبوو بەلام ئەم ڕووداوە تەنهایی‌یانە وا ئەگەیەنێ کەئافرەت دەسەلاتی بەسەری ولاتانی ئیسلام گیراوە ؟ . ئەمەش تەنها لە بەر ئەوە بووە کە ئافرەت وەکو چینێك لە چینەکانی کۆمەڵ ئامادەو دەست بەتال بێت بۆ کارێکی زۆر گرنگ ئەوەش داهێنان و پەیدا بوونی ئادەمیزادی دوا ڕۆژە و ئاگادار کردنی بەرزترین کۆمپانیا کە مرۆڤی لێ دەرئەچێت ئەویش مال‌و خێزانە ، ئافرەت لە مالی باوکی بژێوی لە سەر باوکیتی وە لەسەر دایکیتی فێری هەموو هوونەرێکی مالداری بکات بۆ ئامادە بوون بۆ کار کردن لەم کۆمپانیایە دەرچووی قوتابخانەی هونەری ئافرەتان بێت کەتیای دا ( دایك فێر ئەکات و باوك بە خێو ئەکات ).. وە ئافرەتی موسلمان بەبێ ئەوەی ڕوو لە گۆرەپانەکانی شار بکات و داوای مافی خۆی بکات وبەبێ ئەوەی بە پلیکانەی کوشکی پەرلەمان‌و هەلبژاردنا هەلگەڕێت مافی تەواوی‌خۆی پێ دراوە لە ژێر سایەی دەسەلاتی ئیسلامی لە کارو باوەڕپێ کراو ..

ئیسلام ئافرەتی بەمەزن ترین ئادەمیزاد داناوە لە قورئانی پیرۆز لە دەیاجێ باسی کردووە و خوای گەورە ئافرەتێکی خوا پەرست و ڕەوشت باشی بە هەزارا پیاوی دل پیس و ڕوو رەش و پیاو کوژ ناگۆڕێتەوە لە تەرازووی حیساباتی یەزداندا •

هەروەکو ( ئاسیا ) ی ژنی فیرعەون لەو کاتەی میردەکەی بەهێز ترین شای جیهان ئەناسرا بروای بە خوای گەورە هێناو خوای گەورە خستیە ژێر سێبەری خۆیی و لەتەنگ و چەلەمەی ژیان گەیان دیە ئەو جێگایەی دایکی موسلمانان چاوە ڕوانیان ئەکرد •

بۆ یە ئیسلام پارێزگاری ئافرەت ئەکات لە هەموو تەنگ و چەلەمەیەك ونایەوێ ئافرەت لە کۆلانان بسوورێتەوە ئیسلام نایەوێ ئافرەت بە رۆژو شەو بێتە کەل وپەلێك لە باوەشی خەلکا بخولێتەوە ئیسلام نایەوێ سەرۆکی پارتە ڕامیاری یەکان بۆ مەرامی خۆیان ئافرەت بکەنە پەیداغێك بەرزی کەنەوە کە ئەیانەوێ و گرمۆلەی کەن گەر نەیان ویست نایەوێ ئافرەت بیێتە پول وپارە لە هەلبژاردنا دەنگی پێ بکڕن ئافرەت زۆر لەوە بەرز ترە کە کەسان لەگەل شوشەیەك ویسکی بیخەنە سەر مێزی قومار کردن ••

ئافرەت زۆر لەوە بەرزترە کە بێتە جیهازێك و لەگەل سیخوراندا کاری پێ بکرێت • • دوا ڕۆژی بەرز هەردەم لە ئافرەت چاوەڕوان ئەکرێ •

چاوە ڕوانی پاڵەوانانی میللەت لە ئافرەت ئەکرێت زۆر لە ڕۆشنبیرو زاناکان تێك چوونی شارستانیەت لە تێك چوونی خێزان دادەنێن •

بە هیچ جۆرێك ئیسلام تێکەڵ بوونی ژن و پیاو بە ڕاست دانا نانێت •• چونکە تێکەڵ بوونی ژن و پیاو بۆ هەرشتێك بێت گەر دووریش بێت لە ڕابواردن بەڵام ئافرەت و پیاو هەر کاتێ لە یەك نزیك بوونەوە •• هەر دووکیان بیر لەیەك شتی هاوبەش دەکەنەوە زانایانی سایکلوجی ئەوەیان سەلماندوە لێرەدا دەمەوێ شتێك ڕوون بکەمەوە ئەویش ئەوەیە گەلێ لەو کەسانەی لەماڵەوە ئافرەتیان دەست ناکەوێ ( جاچ لەبەر هەست بەلێ پرسینەوە نەکردن یاژن نەهێنان ) بە دوای ئەوەی لە دەرەوەی ماڵ لەهەموو جێگایەك لە گەل ئافرەتان تێکەڵ بن و بە ئاسانی حەزی گڵاوی خویان وەدەست بێنن •• ئەوانە بۆیە دەڵێن ئافرەت گەر لەدەرەوە کار نەکات نەبێ بە فەرمانبەرو لە هەڵبژاردن و جێگری و ڕامیاری دا کار نەکات سەر بەرزی خۆی وە دەست ناهێنێ و کار نەکردنی لەمانە ملکەچیو سەر شۆڕی دەگەیەنێ • ئێمەش دەڵێین :-

لە مەسەلەی ڕامیاری ڕوونمان کردەوە ئیسلام حەز بە کاری ئافرەت ناکات لە ڕووی ڕامیاری‌یەوە بەڵام ئافرەت دەتوانێ دەنگ بدات و هەڵبژێرێ ) بە مەرجێ لە ڕێڕەوی ئیسلامەتی لانەدات و لە بەیانی تا ئێوارە لە گۆڕەپان و ژوورە تایبەتیەکانیان لەگەڵ پیاوان

کۆنەبنەوە و تێکەڵاو نەبن .. لە جێگرایەتی ( النیابة ) دا ئافرەت بۆی هەیە کار بکات وەکو دەزانین نیابە لە یاسادانان و چاودێری کردنی دەسەڵاتدارێتی ڕاپەڕانـدن پێك هاتووە جا ئیسـلام ڕێی ئافرەت ناگرێ لە یاسادانان و لە چاودێری کردنی کارو باردا .. بەڵام بەمەرجێ دژی خراپە بووەستێ و پشتگیری ڕاستی و چاکـە بکات و لە پەیرەوی ئیسلام لانـەدات ..

## ئافرەتو .. مافی خوێندەواریو زانیاری

ئافرەتی پێش ئیسلام لە هەموو جۆرە خوێندەوارییەك بێ بەش بوو .. ئیسـلام داوای فێر بوونی ئافـرەت و پیاوی کـرد بەیەکجار .. تـا ئێستا هیچ جـۆرە دەقێـك نییـە ئافـرەت لـە خوێندەواری بێ بەش بکات ... لـە مێژووی ئیسلامدا چـەندەها ئافرەتی زانـاو ڕۆشنبیر ناوبانگیـان دەرکـردوە لـە زۆر کتێبدا باسیان کراوە .

لەوانە ( فاتیمەی کچی شێخ عەلائەددینی سەمەرقەندی ) بەناو بانگ خاوەنی کتێبی ( توحفەی فوقەها ) ئەو کچە زانایە مێردی بـە قوتابیەکی باوکی کرد کە ناوی عەلائەدینی کاشانی بوو خاوەنی زۆر نووسین و کتێبی بەرزە و لە ساڵی ( ٥٨٧ ی کۆچی ) کۆچی دوای

کردوه ، زۆر جار نووسین و کتێبەکانی مێردەکەی سەردەمی خۆی ڕاست دەکردەوە و ڕێگای ڕاستی نیشان دەدان •• نەزانین و پاش کەوتنی ئافرەت بووە هۆی پاش کەوتنی ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانی زانیاری سەردەمی ئیسلامدا • بەڵام بەپێی ڕێرەوی ئیسلام گەلێ لەو وانانەی کە کچ لە خوێندنگا دەی خوێنێ هیچ پەیوەندی‌یەکی گرنگی بەژیانی ئافرەتەوە نی‌یەو تایبەتە بەپیاو •• بۆیە ئیسلام داوا دەکا دەبێ ئەو وانانەی ئافرەت دەی خوێنێ پەیوەندی تەواوی بەباری ژیانی ئافرەتەوە هەبێت وەکو ماڵداریو پەروەردە کردن و سایکلوجی منداڵ و ئەو دەرسانەی کە پەیوەندی بە فێر بوونی هونەری ئافرەت هەیە ••• چونکە ئافرەت ئەو ڕێگایەی لە پێشە کە ڕۆژێك ببێتە دایكو خاوەنی ماڵ و مندال ••• هیچ زیانێکی نی‌یە کە ئافرەت فێری هەموو جۆرە زانیاریەك بێت لە ڕێکخستنی ماڵدا تا ئەگاتە زانیاری ( ئەتۆم ) بەڵام بە هیچ جۆرێك نابێ ئەو زانیاریانەی پەیوەندی بە ژیانی ئافرەت هەیە فەرامۆش بکرێت •

## ئافرەتو •• دەستکەوتی ئابووری

مەبەستمان لەباری ئابووری ئافرەتە وە ئەوەیە کەوا هەر شتێك کە دەستی کەوێ و چونیەتی بۆ چوونی ئاڵ و گوڕ کردنی و ڕەفتار کردنی لەو دەست کەوتە ••• بەپێی ئەو بارە خوا پێداوانەی کە خوای گەورە وەکو پیاو بە ئافرەتی داوە لە بڕمێشکی

و بوونی هەستی گیان و سۆزی دەروون ... ئافرەت ئەتووانێ خۆی ڕەفتار لەگەل دەورووو بەریا بکات بەبێ ئەوەی کەسێ دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکات هەر لەبەر ئەوەشە کەوا ئەبێ خوا بپەرستێ و لە کۆمەڵدا ڕۆلێکی هەبێت و خۆشی ئال و گۆڕی دەست کەوتە ئابوری یەکانی بکات ... ئیسلام بەم ڕێرەوە پیرۆزەی ئافرەتی لە بیرەکۆنەکانی سەردەمی ڕۆمەکان و عەرەبە دواکەوتەکان رزگار کرد ئیسلامی پیروز بریاری‌دا ئافرەت مافی هەبوون و میرات گرتنی هەیە وەکو خوای گەورە ئەفەرمووێ :ـ

[ للرجال نصيب مما ترك الوالدان والاقربون وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والاقربون][1] بەم بێیە ئافرەت توانی میراتی باوکو مێردی و برایی و کوڕەکەی بگرێت لەو کاتەی لە سەردەمی پێش ئیسلام ئافرەت مافی ئەوەی نەبوو داوای مارەیی خۆشی بکات .

ئیسلام بریاری دا کەوا مارەیی‌مافی ئافرەتەو ... کەسی تر مافی نی‌یە دەست کاری بکات و دەستی لێ بدات :ـ

[ وآتوا النساء صدقاتهن نحلة ][2]

## ئافرەتو .. مافەکۆمەلایەتیەکانی

ئاینی ئیسلامی پیرۆز بڕیاری بەدی هێنانی گشت مافە

(١) سورەتی النساء ئایەتی ـ ٧ ـ

(٢) النساء : (٤)

کومەلایەتی یەکانی ئافرەتی داوە و بە کورتی باسی هەندێ لـەو مافانەی ئەکەین کەوا ڕێرەوی ئیسلامی پیرۆز بە ئافرەتی داوە :ـ

١ ـ کچێك کە گـەورە بوو و خـۆی ناسی و نیشانەکانـی ڕەوشت باشی و پرمێشکی‌لێ دەرکەوت خۆی ئەتوانێ خۆی بەرێوە ببات کەسێك ناتوانێ دەستی بە سەرپا بگرێت بەبێ دلی خۆی جا ئەو کەسە چ باوکی بێ یا یەکێکی تر ... بەبێ یاریدە دەر ئەتوانێ ڕەفتار لەگەل دەوروبەری بکات و خـۆی لێ‌پرسراو بێ بەرامبـەر هـەموو کاروو بارەکـانی ئابووری و نەهێنی‌یەکـانی خۆیی و ئـەو جێگایەی خۆی ئەیەوێ لێ‌ی بژیت ئەتوانێ خۆی تەرخانی بکات.. کەسی ناتوانێ بە نادلی بێ‌کێشیتە لای خۆی ..

٢ ـ خۆی خاوەنی بڕیاری خـۆیەتی ئەتوانێ ئـەو کەسەبە هاوسەری خۆی هەلبژێرێت کە بەدلیەتی یا خوود نەیەوێت گـەر بەدلی نەبوو .

هیچ کەسێ ناتوانێ زۆری لێ‌بکات کە شوویەکی بکات و حەزی لێ ناکات یایەکێ کە خۆی هەلی بژێرێ کەسی ناتوانێ لێ‌ی قەدەغە بکات بە مەرجێ‌هاوسەرەکەی خاوەن ڕەوشتێکی موسولمانانە بێت هەروەکو پێغەمبەری مەزن ئەفەرمووێ و [ لیس للولی مع البنت أمر ] (١) وانیشان ئەدا کەوا لێ پرسراوە کچ ناتوانێ زۆری لـێ

(١) ابو داو و نسائی ئەگیرنەوە .

بکات هەروەکو ڕوونمان کردەوە هەروەها ووتە بەنرخەکەی :ـ

[ البنت احق بنفسها من وليها والبكر تستأذن في نفسها واذنها صمتها ][2] ئەم ووتەیەشی هەر ئەمەی دوایی ڕوون ئەکاتەوە کە ئافرەت خاوەن بڕیاری خۆیەتی ئەبێ کچ بە دڵی خۆی شوو بکات هەروەکو ئەگێرنەوە :ـ

( کەوا خەنسای کچی جزام کاتێ شووی کردەوە ویستیان بیدەن بە پیاوێك و حەزی لێ نە ئەکرد کاتێ پێغەمبەری مەزن بەمەی زانی هاتوو ئەم شووکردنەی بەتاڵ کرد )[1] ئەم پایە بەرزەی ئاینی ئیسلام بە ئافرەتی داوە هیچ یاسایەك لە جیهان و هیچ شارستانیەتێك نەی توانیووە ئەم پایەی بۆ ببەخشێت کەوا خۆی بانگ هێشتێکە بۆ ئازادی ئافرەت ..

ئەمەش ئەوەیە کەوا ڕێبڕەوی ئیسلام ڕێگای داوە پەنا بەرێتە بەر ئافرەت و هەر کەسێك پەنای بردەبەر ئافرەتێك نابێ ئازاری بدرێت هەروەکو پەنا ئەبرێتە بەر پیاوێکی گەورە ... ئەگێڕنەوە کەوا [ کاتێ کە موسولمانەکان مەکەیان داگیر کرد پیاوێکی خوانەناس لە ترسی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رض) پەنای بردە بەر ـ أم هانی کچی ئەبوتالیب ـ کاتێ عەلی ویستی هەر

(١) ( رواة جماعة الا البخاري ) .

بیکوژێت پێغەمبەری مـەزن بەمەی زانی فەرمووی هـەر کـەسێ بەنای بردە بەر تۆ ئێمە لێی خۆش دەبین‌و ئازاری نادەین :ـ

[ قد أجرنا من اجرت يا ام هانی ][1] هەر وەها فەرموودەکەی دایکی ئیمان داران ( عائشه ) (رض) کە ئەفەرمووێ کاتێ یەکـی پەنای بردە بەر ئافرەتێك ئەبێ وازی لێ بهێنرێ[2] ئەم بەندە بـە چوانترین شێوە یەکسانی ئافرەت لەگەل پیاو دەرئەخات و هیـچ جیاوازیەك ناهێڵێتەوە کە باس بکرێت [ والمؤمنون والمؤمنات بعضهم اولياء بعض ، يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصـلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسوله اولئـك سيرحمهم الله ، ان الله عزيز حكيم ][3] .

گوێ ڕایەڵی فەرموودەکانی خواو پێغەمبەرن و لە بەڵێن و پەیمانی خۆیان پەشیمان نابنەوەو مل کەچن بۆ یان‌و حەز لە چاکە ئەکەن‌و و دژی خراپە ئەوەستن ... هەر ئەمانەن کە خوای گـەورە و میهربان و بەخشندە و دانا لێیان خۆشی ئەبێت ... لێرەوە نیشان ئەدرێ کەوا باوەڕجەمسەرو رۆلگەیەکی‌تایبەتی‌یە لە بوونی‌مرۆڤدا

---

(١) ئەحمەد و ئەبو داود و ابن ماجه ئەگێرنەوە .

(٢) ئەبو داود والنسائی ئەگێڕنەوە .

(٣) التوبة ـ (٧١) .

هەموو هەست و بیری مرۆڤ بە دەوریا ئەخولێتەوە •• باوەڕ شتێکی چەسپاوە لە مێشك و گیانی خاوەن باوەڕاندا ••

لە ڕێ ڕەوی ئیسلام دا مرۆڤ پێوان و سنووری بۆ دا دەنرێت بەپێ چۆنیەتی ئەو باوەڕەی هەیەتی ••• ئافرەت و پیاو هاو بەشی لەگەڵ یەکتر ئەکەن لە هەموو شتێکا لەسەر بنچینەی باوەڕا ••• لەڕێڕەوی ئیسلامدا ئافرەت وپیاو وەکو یەکن بەڵام بەپێ بوون وزیادەی باوەڕ لەهەر یەکێکیانا بەرزی و توانای خۆ بەخشینی ئەو کەسە دیار ئەکرێت و لە لایەن خـوای گـەورە بەرزی بۆ ئـەو ئافرەتە یە کە زیاتر لە کەسانی دەوروبەری باوەڕ لە دلیا جێگیرە ئەو ئافرەتە گیانی نامرێت کەوا باوەڕ بەخواو ڕێڕەوی ئیسلامەتی دلی ڕۆشەن کردۆتەوە •••

چۆن لەسەر پیاو واش لەسەر ئافرەت پێویستە دژی خراپەو نەزانی و بەد ڕەوشتی وهەژاری وبێ دادی و زۆر داری بوەستـێ ئافرەت لێ پرسراوە بەرامبەر ئەم کردارە نابەجێ یانەی لەدەورو بەریا ڕووئەدات بەپێی توانای خۆی ئەبێ دژی بێ دادی وهەژاری ونەزانی و بەد رەوشتی بوەستێت ، ئافرەت لەوکاتەی زانی کـە خـۆی لەدەست نـاداو نابێت بەئاڵە. تێکی دەستی پیاو ئەتوانێ لـە ڕێکخراوە ڕامیاری یەکان کە لەڕێ ڕەوی ئیسلام لا نادەن کار بکات و ئاگاداری هەلس و کەوت و کاروباری گشتی بێت هـەر وەکـو

پێغەمبەری مەزن ئەفەرموێ ئەو کەسەی کەمتەرخەمی لە کاری موسلمانان ئەکات و ڕوویان پێ نادا بە مووسولمان ناژمێرریێ •

« من لم یهتم بأمر المسلمین فلیس منهم »[1] •

ئادمیزاد لەو کاتەی ئەتوانێ کاروباری جیهان بەرێوە ببات وا بەش کراوە هەندێ بە پیشەسازی و هەندێك بە کشتوکال هەندێ بە بازرگانی و هەندێکی تر بە دادپەروەری و هەندێ لە کێشەکانی کۆمەل ئەکۆڵنەوە وەکو هەژاری و نەزانی و هاوکاری کردن یا کارکردن لە بەشەکانی ڕۆشەنبیری و ڕەوشت بەرزی و خێزان ••

هەر کەسی بەپێی دەور و بەرو سنووری خۆی ، لەم هەموو کارانە کە ئافرەتیش وەکو پیاوە و ئادەمیزادیکە و گرنگی خۆی هەیە و ئەتوانێ بەشداری ئەم کارانە بکات •

ئافرەت لە هەموو کات و ساتێکا جوانترین و پیرۆز ترین خۆ بەخت کردن نیشان ئەدات لە کاروباری جیهان و ئاین پەروەری و خێزان داری و کۆمەڵ لە شەڕ و ئاشتیا لە هەلگرتنی گیانێکی بەرز هەستێکی بەرز ئافرەت لە ئاشتیا پیرۆز ترین خۆبەخت کەرە هەموو کاتێکی خۆی دا ئەنێت بۆ بەروەردە کردنی مرۆڤی دوا ڕۆژ و خێر و خۆشی مێردەکەی و خێزانەکەی ••• لە کاتی شەڕ هەلگیرسان

(١) بیهقی لە شعب الایمان ئەگێڕێتەوە •

کێ ئەتوانێ بەرزترین نمونەی ئازایەتی و خۆبەخت کردن نیشان بدات وەکو ئافرەت هەر ئافرەتە کەوا مێردە خۆشەویستەکەی و باوکی منالانی لە دەست ئەدا .. کوڕە جەرگە سۆزەکەی لە دەست ئەدا جگە لەو کاتانە لە ڕاژەیی لە شکرایە و لە چارە سەر کردنی نەخۆشان لە برین پێچی ڕزگار کردنی برینداران لە گەرمەی شەڕا کارکردنی لە مانگی سوور ( الهلال الاحمر ) دا ..

ئافرەتی ئیمرۆ گەر ئەم کارانە ناکات مانای وانی یە کە ناتوانێت بەڵکو مانای ئەوەیە ئەم ڕێ یەی نیشان نادرێت و ماوەی نادرێت .

## بەرزی ئافرەت لەچی دایە

باشترین کار کە ئافرەت پێی هەڵدەستێ پەروەردە کردنی منالە .. هەر چەندە پیاو وورد بین و بیر تیژ و بە سۆز بێت ناتوانێت وەکو ئافرەت بەو کارە هەڵستێ .. هیچ جۆرە پیشەسازی یەك و پەدی هێنانی ئامانجێك و کارێکی گرنگ هەر لە دروست کردنی دەرزی یەك تا دەگاتە دروستکردنی ڕۆکێت ئەوەندەی پەروەردە کردنی مندال وورد بین و دڵسۆزی و فیداکاری و گیان بەخشینە ڕەخساندنی تەواوی دڵ و دەروونی دەوێت بۆ ئەو کارە لە تەك ماندو بوونێکی گشتی ئەندامەکانی لەشەوە .. هێنانە دی بەرهەمێکی پاك و خاوێن ... بۆ ئامادە کردنی ئەو نە بەزانەی لە دوا ڕۆژدا ڕۆکێت

دروست دەکەن پارێزگاری وولاتەکەیان دەکەن و هونەرمەندی بەرزیان لێ دەر دەچێ •

دەبێ ئەوە بزانین کە لەکاتی منداڵیەوە ئەو منداڵە هەر نەخۆشیەکی مێشکی و گرێی دەروونی بوو بێت بەهۆی •• پەروەردە کردنێکی چەوت ئەو منداڵە لە دوا ڕۆژدا لەجیاتی ئەوەی بێتە پاڵەوانێك لە هەموو مەیدانەکانی ژیاندا •• بە جەردە و پیاو کوژ دەردەچێت بە دز بە درۆزن دەردە چێت چونکە دەوروبەر (محیط) ژیانی یارمەتی دەرە بۆ چەوت بوونی •• وەکو زاناکانی پەروەردەکردنی منداڵ سەلماندوویانە کە ئەو منداڵانەی لە دایکی ڕاستەقینەیان دوور دەکەونەوە لەو جۆرە نەخۆشیانەی باسمان کرد بێ بەش نابن •

لە سەردەمی هێزی دەسەلاتی ئیسلام ئافرەت دلێرانە کاریان دەکرد لەو کارانەی خۆی پسپۆری و شارەزایی تیا هەیە وەکو : فێر کردنی کچ و دەرمان کردنی ئافرەتان و برین پێچی شەرکەرانی جەنگ و پشکنین لەبازاڕداو کە ئافرەت لە پیاو زیاتر سەری لێ دەر دەچێ ••

لە ڕێڕەوی ئیسلام پێویستە ئافرەتیش وەکو پیاو ئامادە بکرێت بۆ کارکردن لە دەرەوە •• کاتێ کە پێویستە یاخود کەس نی یە ماڵ و منداڵەکەی بەڕێوە ببات وەکو لەپێشەوە باسمان کرد بەلام ئیسلام

به هیچ جۆرێك ڕێ نادات كار له دەرەوە بكات له سەر حیسابی كاری دایكایەتی و پەروەردە كردنی منداڵ پشت گوێ بخرێت ‎..‎ دەبێ كاركردنیش لەدەرەوە له پێناوێ پێگەیاندنی منداڵەكانی بێت به ڕێگایەكی باش به هیچ جۆرێك ئیسلام وەكو وولاتانی ڕۆژ ئاوا ڕێگای ئافرەت نادات له بەیانی تا ئێوارە لەدەرەوە بسورێتەوە جا بۆ هەرچ كارێك ‎..‎ لەو كاتەی منداله‌كانی بەدیار ئافرەتێكی بێگانه دا ئەنیشن و حەز به چارەی ناكەن ‎..‎ گرێو دەروونی لێرە پەیدا دەبێت ‎..‎ هەموو نەخۆشیەكانی كۆمەڵ لێرە پەیدا دەبێت ‎...‎ له ڕێڕەوی ئیسلامدا دروست كردنی ئادەمیزاد به ڕێگایەكی خاوێن بەرز ترین كارە ‎..‎ ئادەمیزاد كه خۆی به خاوێنی دروست نەبووبێ هیچ كارێكی خاوێنی لێ وەدەست نایێ دەبێ جار به جار كابرایەك دایك و باوكیش نەدیووە بەلام جۆرە هونەرێكی یا كارێكی ئەنجام داوە دەبێ ئەوە بزانین ئەو كابرایە سۆزی دایكێتی له دڵو دەروونی نەچەسپاوە هەتا دەمرێت هەر ڕەش بین و له دونیا بێزار و هەموو كاتێك ڕۆو كینه دڵی گرتۆته وە ئەوانە خۆیان له كاروان و ڕێڕەوی ژیان لادەدەن لەبەر نەبوونی لایەنێكی گیانی له شارستانیەته ماددی‌یه زەنگینەدا و یاخی بوو (اللامنتمی)ی پێ دەڵێن لەم سەردەمه (سارتەر) دایك و باوكی خۆی نەدە ناسێ حەزی بەنووسین كرد ‎..‎ ویستی لەسەر ئادەمیزاد بدوێ زیاتر له نیوە

مەدەیەك وەكو (تووتی) هەر ووتەی خۆی دەووتەوە و بۆ خەڵكی دەپەست •• ئەو هەئەرەی لەپاشی بەجێ‌اوە هونەرێكی ڕەش بینە گەنجەكانمان لەگەشبینیەوە دەباتەوە ڕەش بینیەوە وایان لێ دەكا دەست لە ئەژنۆ چاوە ڕوانی مردن بكەن هەوڵدان و دەرچوون لەم قاوغە لە بیر دەباتەوە و بوونەتە بتی ژێر چەپۆكی ترایونزم و ماسۆنی و ووجوودی‌یەكان و بە دوای شلەژانی جیهان دەگەڕێن •

ئەم هونەرمەندە هونەرمەندی كۆمەڵەكە دەلێ یەكەم مامۆستاو یەكەم هونەرمەند فێری كردم دایكمە دەڵێن ئافرەت دەیتوانی دایك بێت و ئەشتوانێ كریكاریش بێت دەبێ بەڵام بە جۆرێ منداڵەكانی نەداتە دەست ئافرەتێكی تر بە هیچ پەیوەندیەكی بیرو سۆز ودەروونی بە منداڵەكانی نا بەستێتەوە ئەو منداڵانەی لە بەخێوگا بەخێو دەكرێن ئەوانیش چارەی ئەو دەردە ناكەن منداڵەكان هەر لە تەمەنی سێ‌ساڵی زۆریش شەڕی دەروونی ئەكەوێتە نێوانیان لەسەر ئەو كەل‌وپەلەی لە بەخێوگا هەیە هەرچەندە هەر منداڵێكیش شتی تایبەتی خۆی پێ بدرێ •• بەڵام منداڵ هەر حەز بەدەست بەسەرا گرتن و شتی منداڵانی تر دەكات •

بەخێوگا دەتوانێ زۆر بەجوانی پەروەردەی لەشی منداڵ بكات و بەڵام ناتوانێت پەروەردەی دڵ و دەروونی منداڵەكە بكات ئەوە تەنیا كاری ڕاستەقینەی دایكە و بەس •

ئەو منداڵەی لە خۆشەویستی دایکی بێ بەش بوو بێت تاکو دەمرێت هەر بە دوای دا دەگەڕێت •• ئەمە سروشتی دەروونی ئادەمیزاد و کەسیش ناتوانێ دەستکاری بکات و بیگۆڕێت • • منداڵ حەز بە دایکێك دەکات کە کەسی تر لە گەڵیا بەشداری نەکات لە خۆشەویستیەکەی سەیر کە کاتێ منداڵێك منداڵێکی تری لە دوا دەبێت تا ماوەیەك هەر ڕقی لێیەتی •• دوایی بەرەبەرە ئەو ڕقە نامێنێ کە هەموو شت تێدەگا جا ئەگەر ئەوە کاری منداڵێك بێت کە بە دوو ساڵ لەوی تر گەورە تربێت ئەی ئەو منداڵانەی یەك تەمەنن لە بەختێوگا • ئادمیزاد بە دوای چ خەون و خەیاڵێکا وا نووستووە حەز دەکا بەرهەمەیماددی باش و زۆر بێت لەوکاتەی بەرهەمی ئادەمیزاد تەواو لە نزمی دابێ !

لە ڕۆژئاوا بە ناوی باری مێژوویی و جوگرافی و ڕامیاری و ئابووری وای بەسەر ئافرەت سەپاند ••• بەڵام ئەی ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامدا ئایا هەموو پیاوەکانمان کەوتوونەتە کارو بەش ناکەن ؟ نەخێر تا ئێستا چەندەها پیاو بە دوای کار دەگەڕێن و بەووڵاتاندا دەسووڕێتەوە •• ئایا هیچ پیاوێك داوا لە ئافرەت دەکات کە کار بکات و خۆی لە ماڵەوە دابنیشێ ؟ دەڵێن کار سەربەخۆیی ئابووری بە ئافرەت دەدات و سەر بەرزی خۆی وەدەست دێنێ ••

ئایا ئیسلامی پیرۆز ئافرەتی لەوەدەست هێنانی سەر بەخۆیی ئابووری بێبەش کردووە ؟

لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامدا وولاتە نزم و هەزارەکان کێشەی هەزاری و بێ دەستەلاتی و سەر لێ دەرنە چوونی ڕژێمەکان چۆنیەتی بەختیار کردنی ئادەمیزاد یا بۆ قایم کردنی خۆیان ، لەبارەگای حوکمڕانی ملیونەها ئافرەت و پیاو لەبەر هەم و دەست کەوتەکانی وولاتەکەیان بێبەش دەکەن ..

دەڵێن ئەگەر ژن و مێردێك کار بکەن دەست کەوتی ڕۆژانەیان باشتر ئەبێت . بەڵێ ئەوە ڕاستە ئەگەر وەکو ووتمان لەسەر حیسابی ماڵ و منداڵەکانیان نەبێت لە وولاتێکی وا کە کار کەم دەست دەکەوێ ئافرەت لە جێگای پیاو کار بکات ئەی پیاو لەکوێ کار بکات .. شتێکی ئاشکرایە خاوەن کارگەکانو کێلگەکان لەو وولاتە هەژارانە ئافرەت و منداڵ باشتر دەست خەڕ و دەکەن بۆ کارکردن چونکە گوێ ڕایەڵن و بەکرێی کەم و ڕۆژانەی کەمتر لە پیاو .

جگە لەوەی کارکردن ژن و پیاو لە دەرەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەردوکیان هیچ کاتێك هەست بە حەسانەوە نەکەن باشە چ حەسانەوەیەك ، مشووری ماڵ و مندال بریتیە لە کارگە یەکی وا پێویستی بە بەرێوەبەرێکی تایبەت هەیە .. گەر ئەو ماڵە بێ بەرێوەبەر بوو ئاژاوە ڕووی تێ دەکا .. جا چ جۆرە مێشکێك ئەوە قەبول دەکا .

زۆر ژن و مێرد دەبینین یەکێکیان لە شارێك فەرمانبەرەو ئەوی تر لەشارێکی تر .. باشە خۆ ئەو ئافرەتە و پیاوە فریشتەنین دەبێ جار بەپێ دژە تاوانێکی ڕەوشتی لێیان ڕوو نەدات بە تایبەتی لە پیاوەکە .

چارەی ئەو هەژاری‌یەی ڕووی کردۆتە ئەو وولاتانەی رۆژ هەلات ئەوەیە : بەرزکردنەوەی ووزەی بەرهەم وە بەرهێنانە تاکو تەنها کار کردنی پیاو ببێتە هۆی نەهێشتنی هەژاری نەوەك بەوە چاری بکەین ئافرەت بەر بەرەکانی پیاو بکات بۆ ڕێگاکانی ژیانێکی کامەران .

ئیسلام سەیری ئادەمیزاد دەکات لە لایەنەکانی چۆنیەتی درووست بوونی هەستی دەروونی و لایەنی پێویستی ئادەمیزاد ، ئافرەت بۆی هەیە زۆر کار بزانێت بەلام بۆچی ئەو کارە نەکات کە لە هەوەڵەوە بۆی تەرخان کراوە و بۆ ئەو کارە درووست بووە کە مەزنترین و پیرۆز ترین فەرمانی ئادەمیزادە کە ئەویش دایکایەتی‌یەو بەرێوەبەرایەتی ماڵە کە ئافرەت رسپۆرێکی بێهاوتایە تیای‌دا ، بۆ گەیاندنی کاروانی ژیان بۆ جێگای تایبەت ئافرەت گەر مێردی هەبوو نابێ دڵ تەنگی ڕووی تێ بکات لەبەر نچۆنیەتی پەیدا کردنی پێویستیەکانی ژیان تاوای لێ بکات لە فەرمانی تایبەتی خۆی دوور کەوێتەوە .. بەڵکو لە سەر مێردەکەی پێویستە و لە

سەرشانیەتی کار بکات و ئەوەندەی دێتە دەستی لێیان خەرج بکات •

ئافرەت لە سەر ئەو فەرمانەی کە بێی سپێرراوە لە ڕێڕەوی ئیسلامدا جێگای ڕێز لێنانەو ئاگاداری دەکرێت،یەکێك لە پێغەمبەری مەزنی پرسی :

[ کێ باشترە بیکەم بە هاودەمم پێغەمبەر لە وەڵامدا سێ جار گووتی دایکت پاشان فەرمووی باوکت ](1) ئەو مافانەی کە ئیسلام بە ئافرەتی داوە زۆر زیاترە لەوەی ئافرەت لە ڕۆژئاوا بە هۆی بەرلەمانەکان و کۆنگرەکانی وەدەستی هێناوە ••• ئافرەت یەکسانی دەوێ لەگەڵ پیاو ؟ بەڵێ ئیسلام ئەو مافانەی پێ دەدات لە بەرامبەر یاسادا ، دەیەوێ سەر بەخۆیی‌یەکی ئابووری و ئاڵوگوڕی ڕاستە و خۆ لەگەل کۆمەلدا بکات ؟ بەڵێ ئیسلام یەکەم ڕژێم بوو ئەو مافانەی دا بە ئافرەت کە دەیەوێ فێری خوێندەواری بێت ؟•• بەڵێ ئیسلامی پیرۆز نەوەك هەر ئەو مافانەی پێداوە بەڵکو بە ئەرکی سەرشانی دانا ، دەیەوێ بە دڵی خۆی شوو بکات ، دەیەوێ ڕەفتاری نا بەجێی لەگەڵدا نەکرێت مادام بە ئەرکی سەرشانی هەڵدەستێت دەیەوێ هەر کاتێ لەگەڵ مێردەکەی نەگونجاو ژیانی بوو بە دۆزەخ لە مێردەکەی جویێ بێتەوە ؟ ••

(1) رواه الشیخان •

بەڵێ •• بەڵـێ ئەو مافانەی ئافـرەت لەسەر پیاویش فـەرز کـراوە ••

دەیەوێ کار بکات ؟ بەڵێ ئیسلام ئەوەشی بۆ داناوە ئایا ئەوانەی لەسەرەوە باسمان کرد ئافرەت گەرەکیەتی یادەیەوێ بەرەو ئاژاوەی ببـات یـا دەیـەوێ هـەرشەوە لـە باوەشـی کابـرایەك بێتو بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵنەسێت کەداهێنانو پەروەردەکـردنی ئادەمیزادە •• نەخێر ئەو مافـە ئیسـلام لـــە ئافـرەتی قەدەغـە کردووە و دەیکات بۆ بەرژەوەندی هەموو ڕۆڵەکانی جیهان لە نێر و مێ بۆ بەرژەوەندی پێشکەوتنی شارستانیەت •• ئەو مافە لە پیاویش قەدەغە کراوە نەوەك هەر لە ئافرەت ، •• بۆی هەیە هەندێ بڵێن : ئێمە چ کارمان بـە باری جۆرا و جۆرو ڕەوشتی جۆرا جۆر هەیە کە بـاری ئـافرەت لـە ڕۆژهەڵات بەرەو دواکەوتن دەڕوات لەو کاتەی ئافرەتی ڕۆژئاوا جیگای خۆی لە ناو کۆمەڵ کـردۆتەوەو لـە سەر ئافـرەتی ڕۆژهـەلات پێویستـە ڕێگای ئەو بگرێ بۆ سەندنی مافی خۆی ؟ لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێین : ڕاستە ئافـرەت لە وولاتانـی ئیسـلامدا بـە گشتـی دوا کـەوتووە •• نەخـوێندەوارە •• وەکـو گیانلەبەر دەژی لـە پیسی لـەش و دەروونی پێچراوەتەوە ، ماندوو دەبێ کامـەرانی بە چـاو نابینێ •• دەبەخشـێ و وەرناگرێ لە بازنەی پێویستیەکانی پیاوەدەرناچێت •• بەرز نابێتەوە ئەوانە هەمووی ڕاستە •• بەڵام ئایا کـێ تاوانبـارە لێپرسراوە بەرامبـەر بـەو ڕاستیە نا لەبارانە ؟ ئایا ڕێرەوی ئیسلام وڕەوشتی ئیسـلام ؟ •• ئەوبـارە

نارێکەی ئافرەتی ڕۆژهەلات تیای دەژی دەگەڕێتەوە بۆ باری ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕامیاری و سایکلوجی کە شایانی نارەزایی دەربڕینە ، دەبێ بزانین کە لە کوێوە ئەو بارە نارێکەمان بۆ دێ و چاکی بکەین •

ئەو هەژاری یەی ڕووی کـردۆتە وولاتـانی ئاسیـا و ئەفەریقا بۆ ماوەی چەند سەدەیەك •• ئەو زۆرداری یە کۆمەلایەتیەی کە چینێـك لە بەیانی تا ئێوارە دەگەڕێ و نانی چەنگ ناکەوێ •• بەرگی چەنگ ناکەوێ کە خوێ تیا حەشار بدات •

ئەو بارە ڕامیاریانەی کەوا کەرتێك کەرتێکی تر ژێر پێ دەخا و دەی چەوسێنێتەوە •• بەلێ ئـەو زۆرداری یە نالەبارانە و شلەژانـی نەفسی و دەروونی کە هەزارەها نەتەوە تیای دا دەژین ئەوانە هەمووی لێپسراون بەرامبـەر بەو بـارەی ئافـرەت تیـای دا دەژی •• لـە دەربەدەری و نزمی باری ژیان ، ئەوەی ئافرەت پێویستیەتی •• سۆزە ڕێز گرتنی ڕێك کەوتنی لەگەل پیاوەکەی ، بەلام هەژاری چەندەها سۆزی دەروونی وا ژێر پێ دەخات تەنها بۆ ئەوەی لەو پەستاوەی تیای دایە دەرچێت ••

پیاو لە دەرەوەی مال لە ژێـر دەستی ئاغا و خـاوەن زەوی و کوێخا و پۆلیس و سەرباز و خاوەن کارگەکـان دەچەوسێتـەوە • بەرزی و کامـەرانی بەر فوویەکـی جگـەرەی خاوەن کارگەکـەی دەکەوێ •• ئەویش بۆ ئەوەی نەختێك بوونی خۆی بسەلمێنێ کۆلو

خەمی خۆی بە ئافرەتە هەژارەکەی دا دەڕێژی یـا بـە منداڵەکـانی تووشی دەربەدەریان دە کات لەبەر تووش بوون بە (نەخۆشیەکـی دەروونی ) ئەم چەرخە ،وا دەزانێ بەم جۆرە ڕەفتارەی لەگەڵ ژنەکەی دا بوونی خۆی دەسەلمێنێ کە پیاوە •

ئەو هەژاری یە بێ بەزەیی یەی تووشی کۆمـەڵ دەبێت نـەوو ڕۆژ لە بیری پیاو دەرناچێت ووزەی دەروونیو دەمـاری بەبا دەدات ، ئەو ماوەی نامێنێت کە ئەو جیهانەی بـۆ خۆی دروست بکـات کـە نەختێك کامەرانیو بەختیاری باوەشی پیا بگرێتەوە ، ئەو هـەژاری یە وا لە ئافرەت دەکات ژێر دەستی پیاو بێت و لـە ڕەشایی ژیانا ئـەو ئازارە بکێشێت •• ئەوەی بـەلاوە باشترە لە دەربەدەریو بێ کـەسی چونکە هەموو کاتێك هەر لەترسایە ونەوەك مێردەکەی بەڕەللای بکات گەر بەڕەللای کرد منالەکانی باوکیان بەخێویان دەکات بەڵام ئەوکێ بەخێوی بکات لەو کاتەی دەرەوەی ماڵ کار بەدەستی پیاو ناکەوێت تا بە دەستی ئافرەت بکەوێت •

لە کۆمەڵگای دوا کـەوتوودا ڕەوشتی بـەرزی ئادەمیزاد کـەم دەبێتەوە ، پەسەند ترین شت بەلایانەوە ( هێزە ) ، ئەو هێزەی یەکێك دەستی دەکەوێتو ئەوی تر دەچـەوسێنێتەوە گەر ئافرەتێك خـاوەنی ئابووری خۆی بوو دەتوانێ سەری بەرزی خۆی ڕاگرێت ، بەڵام کە هەژار بوو کەلەو بەهێز ترە •• ئافرەتەکە دەچە وسێنێتەوە •

وا دەزانن ژیان لە بازنەی تێکەڵاو بـوونی ژنو پیـاودا دەر ناچێت •• ئەو ساکە ئافرەت دەبێتە پێخەفی پیاوو بەرزی دەروونیو مێشكو گیانی نادۆزێتەوە •

گەر تێکەڵاو بوونی نێرو مێ لە جیهانی گیـان لەبـەران نیشانەی دەسەڵاتی نێرە بەسەر مێ ئەوە لێرە دوو هەستی نزم یەك دەگرنەوە •• ( هەستی دەسەڵات داری لەکاتی کار کردن داو کەمتەرخەمی دوای تەواو بوونی کارەکە ) لە کۆمەڵگای دوا کەوتوودا پەروەردە کـردن پشتگوێ دەخرێت ، پەروەردە یەکەم رێگایە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لـە سنووری مرۆڤایەتی ئادەمیەتی دەرنەچێتو لەرادەی ئاژەڵ بەرزتـر بێتەوە هەر کاتێ پەروەردە کردن وون بوو خەڵکی(هێزەکان)دەپەرستن ژیان بە تەرازووی شەهوەت دەپێون •

بەد رەوشتی لە کۆمەڵی رۆژهـەڵات لەکێشەی ئافـرەت پەیـدا دەبێت ، ئەو کێشانەی ئیمرۆ ئافرەت تیایدا دەژی کامیان لە رێرەوی ئیسلام دا پەیدا بوونە وکەی لەگەڵ گیانی ئیسـلامدا دەرۆن ، هـەر ئیسلام نەبوو کەوا لە سەردەمی [ عومەر کوری عەبدول عەزیز ] دا هەژارێك نەبوو کەبێت زەکات وەرگرێ••ئەوە ئیسلام بوو چەسپانەی کەکەس نابێ هەژار بێ •

ئەو رژێمەی سامان بە داد پەروەری دابەش دەکـات بەسـەر چینەکانی نەتەوەدا ئیسلامە وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :

[ كيلا يكون دولة بين الاغنياء منكم ) •

خوای گەورە بەم ئایەتە پیرۆزە ڕای گەیاند کە نابێ سامـانو مامەلە کردن تەنها لەناو دەولەمەندەکان بسوورێتەوە هەژارەکان لێی بێ بەش بن •

هەژاری یەکەم هۆیە بۆ کێشەی ئافرەتان لەوولآتانی جیهانی سێیەم گەر هەژاری زۆرداری نەماو دادپەروەری ئیسـلام چەسپا ئەو گرێ کۆرەیە لەملی ئافرەت دەبێتەو • گەر وولآت سامانی زۆر بوو ئافرەتیش وەکوپیاو لە خێرو سامانی ئەو وولآتە بەشدار دەبێت•

ئایا ئیسلام تەنها شۆڕشێك بوو بەسەر زولمو زۆریدا ئـەی هەر ئیسلام نەبوو کە پەروەردەیی ئادەمیزادی گەیاندە ئەوروپا •

ڕۆژێکیان (عومەر کوڕی خەتتاب ) فەرمووی ( مل کەچو گوێ ڕایەڵ بن ) یەکێك لە موسولمانەکان ڕاست بۆوەو گوتی : مل کەچ و گوێ ڕایەڵ نابین تا پێمان نەڵێی ئەو ( کەوا ) یە نوێیەی لەبەرتایە لەکوێت هێنا ••• بەڵێ عومەر وەکو سەرۆکانی ئیمرۆ تووڕەیی نـەی شلەژاند وبەڕاستو ڕەوانی بۆی ڕوون کردەوە کەئەو کەوایە هی عەبدوللای کوڕیەتیو کەواکەی خۆی شووڕاوەو لە کەوایەکیش زیاتری نی‌یە ، ئەوسا موسولمانەکە گووتی : ( بفەرموو مل کـەچو گوێ ڕایەڵین ) ئەوە ئیسـلام بوو کە زەمین تەنها یەکجار ناسی •

نابێ پێوانی ئافرەت بە بەهێزیو لاوازی بێت بەلکو دەبێ پێوانی ئادەمیزاد بە ئادەمیزاد بێت پێغەمبەری مەزن دەفەرمووێ :

[ خيركم •• خيركم لاهله وانا خيركم لاهلي ][1] « باشترين كەستان••
باشترين کەسە بۆ کەس‌و کاری‌و من باشترین کەستانم بۆ کەس‌و
کارم » و کەس‌و کارەکەی ئافرەتەو منالەکانیەتی •

ئیسلام دای نەناوە شەوو ڕۆژ لە جیهانی سکس (جنسی)
دابژین تا بگاتە ئەو ڕادەیەی لە ڕەفتاری ئادەمیزاد دەربچین••یا وەکو
ئاژەڵ بژین ••، ڕێرەوی ئیسلام تێکەڵ بوونی ژن‌و مێردی وا داناوە
کە کەئەنهایی‌و دووری ئادەمیزاد لەو تێکەل بوونە نەبێتە هۆی ئەوەی
لە کارو پیشەو هونەرو خوا پەرستیان دوور کاتەوەو شەوو ڕۆژ
بیری لێ بکەنەوە بەلکو دەبێ بە ڕێگایەکی ڕاست‌و ڕەوان بارگەی‌سکس
( الشحنة الجنسية ) بەتاڵ بکرێت بۆ ئەوەی مێشك بیر لەبەرهەم‌و
دوا ڕۆژ بکاتەوە ، زۆر لەگەنجە خۆپەرستەکان ئافرەتیان دەوێ
جوان‌و ڕووت‌و ئەندامەکانی لەشی بەدەرەوە بێ‌و خۆی ژێر دەست
بخات‌و پاش چەند ساتێك بۆی دەردەکەوێ ئەو گەنجەی لەگەڵیا بوو
تێر بوو وئیتر تا جارێکی تر هیچ پەیوەندی سۆزو هەست‌و دەروونی
نایان بەستێتەوە بەیەکەوە • ئەوسا بۆ یەکێکی تر دەچێت‌و ئەمیش
هەروا تاوای لێ‌دێ ڕیزو بەرزی لایەنی ئافرەتی ژێر پێ دەخات
وەکو کچانی ئیمرۆی ڕۆژ ئاوا ، ئەو کەسانەی داوا دەکەن کە
ئافرەت بەو جۆرە بێ ڕێگا بۆ خۆیان خۆش دەکەن تا ئافرەت

---

(١) ترمذی دەی‌گێڕێتەوە •

دەسخەڕۆ بکەن بەکە مترین نرخ • [ زۆر هەیە دەڵێ دەبێ ئافرەت بەڕووتی لەبازاردا بڕوات وچاو لەناو چاوی پیاو بکات بەو جۆرە باوەڕی بەخۆی دەبێتو ترسی لەهیچ شتێك نامێنێت •• ] وا دەڵێن بەڵام لە بیرمان دەچێتەوە کەوا ئەو ئافرەتانەی باش پەروەردە نەکراون هەر کاتێ لە تەنهاییدا گەیشتنە پیاوێك هەموو کەین بەینێکیان لەیاد دەچێتەوەو بە ئاسانی چاوەکانیان لێك دەنێنو لار دەبنەوە •

لێرەدا پرسیارێك لەوانە دەکەم ئایا ئەوەتان بۆ دایكو خوشکی خۆتان دەوێ ؟ یا تەنها بۆ دایكو خوشکانی کەسانی تر ؟

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا دایکی موسولمانان (عائشە) لەسەردەمی خۆیدا بەشداری ڕامیاری گشتی دەکرد ، لەپێشەوەی لەشکر دابوو چاوی لە چاوی ئەوانەی دەنا کەوا لەسەر ڕێ دەوەستان بەڵکو چاوی لە چاوی دوشمنی خۆی دەناو دەجەنگا بەڵام کاتێ قسەی لەگەڵ پیاوێك بکردایە لەو دیوی پەردەوە قسەی لەگەڵا دەکرد چونکە ئەو ڕێیەی بەپاك تر دەزانی •

کاتێ ئافرەتێك گەیشتە پیاوێك و سەری دانەواندو چاو چاوانەی لەگەڵدا نەکرد چی لێ کەم دەبێتەوە ، ئەوە بۆ پیاویش دانراوە کە گەیشتە ئافرەتێکی بێگانە نابێ سێرەی لێ بگرێت ولێی مووڕبێتەوە •

مێژوو دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەرمان لە کچێکی چواردە ساڵان بەشەرم تر بوو لەگەڵ ئەوەی باوەڕیشی بەخۆی هەبوو کەهەلە

ناکات .. بەڵام هەر کاتێ ڕوو بەڕووی ئافرەتێك دەبوو سەری پیرۆزی دادەنەواند .

تاکەی نووسەرو نەزانو نووسەرەکان لەو خەوەدان ئافرەتی ئێمە لەبارێکی باش دانییە ڕاست کردنەوەی ئەو بارە گەڕانەوەیە بۆ ئیسلامی پیرۆز .

ڕێگای ئافرەتانی ڕۆژ ئاوا لەو بارەی تیای دایە بەرزی ناکاتەوە هەرچەندە گەر لایەنێکی بەرزکاتەوە لایەکەی تری دەڕوخێنێت .

# ڕێڕەو وڕێبازی ئیسلام بەرامبەر بە ئافرەت

کورتەی ئەو ڕێڕەوەی کە ئیسلام لەسەر زمانی (محمد د • ) دەری خستووەو پەیوەندی بە ئافرەتەوە هەیە ئەوەیە :ـ

یەکەم :ـ ئافرەت وەکو پیاوە لەمرۆڤایەتی‌دا لەئادەمیەتی‌دا وەکوخوای گەورە دەفەرمووێ ( یا ایها الناس اتقوا ربکم الذی خلقکم من نفس واحدة )[1] یانی خوا لەیەك نەفسی دروست کردوونە ، هەروەکو پێغەمبەر دەفەرمووێ ( انما النساء شقائق الرجال )[2] •

دووەم :ـ ئیسلام وەکو ئاینەکانی پێشوو تاوانی دەرچوونی ئادەمی نەخستە پاڵ ئافرەت •• بەڵکو تاوان هی هەردوکیان بوو ، وەکو خوای گەورە لە چیرۆکی ئادەم دەفەرمووێ ( فوسوس لهما الشیطان لیبدی لهما ماوری عنهما من سوآتهما )[3] دیسانەوە دەفەرمووێ : ( فأزلهما الشیطان عنها فأخرجهما مما کانا فیه )[4] لە پاش پەشیمان بوونەوەیان دەفەرمووێ : ( قالا ربنا ظلمنا انفسنا

(١) النساء : ئایەتی (١) •

(٢) ئەحمەد و ئەبو داود و ترمذی دەگێرنەوە •

(٣) الاعراف : ئایەتی (٢٠) •

(٤) البقرة : ئایەتی (٣٦) •

وان لم تغفر لنا وترحمنا لنكونن من الخاسرين )[١] لێرەدا خوای گەورە هەڵەکە دەداتە پاڵ هەردوکیان‌و پێکەوە داوای پەشیمان بوونەوە دەکەن •• بەڵکو لەم ئایەتەدا خوای گەورە هەڵەکە دەداتە پاڵ ئادەم بەتەنها کە دەفەرمووێ ( وعصى آدم ربه فغوى) •• لە ئایەتێکی تردا باری گرانی دایکە ( حەوا ) لەسەر ئافرەتان لا دەباکە دەفەرمووێ : تلك أمة قد خلت ، لها ما كسبت ولكم ماكسبتم، ولا تسئلون عما كانوا يفعلون ) ئەوان گەلێکی تر بوون‌و لەناو چوون‌و هەر کەس لێ‌پرسراوە بەرامبەر ئەوەی دەیکا لەوانی پێشوو مەپرسن کەوا چیان دەکرد •

سێیەم :ـ لەلایەن خوای گەورە ئافرەت‌و پیاو لە خراپەو چاکەوا وەکو یەك سزاو پاداشت وەردەگرن وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ :ـ

( من عمل صالحا من ذكر او انثى وهو مؤمن فلنحيينه حياة طيبه ولنجزينهم اجرهم بأحسن ماكانوا يعملون )[٢] هەروەها دەفەرمووێ : ( فاستجاب لهم ربهم انى لا اضيع عمل عامل منكم من ذكر او انثى بعضكم من بعض )[٣] •

خوای گەورە لەسەر هەموو پەرستن‌و چاکە کردنێکا وەکو یەك سەیری ئافرەت‌و پیاو دەکات وا لەم ئایەتە پیرۆزە بۆمان

(١) الاعراف : ئایەتی (٢٣) • (٢) النحل : ئایەتی (٩٧)
(٣) آل عمران : ئایەتی (١٩٥) •

دەردەکەوێ : ( ان المسلمین والمسلمات ، والمؤمنین والمؤمنات ، والقانتین والقانتات والصادقین والصادقات ، والصابرین والصابرات والخاشعین والخاشعات والمتصدقین والمتصدقات والصائمین والصائمات والحافظین فروجهم والحافظات والذاکرین الله کثیرا والذاکرات اعد الله لهم مغفرة واجرا عظیما )[1] •

چووارەم :ـ ئیسلام دژی ئەو دوو دڵیەو غەمباری‌یە وەستاوە کە عەرەبەکانی پێش ئیسلام تووشی دەهاتن لە کاتی لە دایك بوونی کچەکانیان خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرمووێ :

( اذا بشر احدهم بالانثی ظل وجهه مسودا وهو کظیم ، یتواری من القوم من سوء مابشر به ایمسکه علی هون ام یدسه فی التراب الاساء مایحکمون ) ئەگەر یەکێك مزگێنی بوونی کچێکی پێ درابایە لە خەم و پەژارەدا دەم و چاوی ڕەش دەبوو و لە ناو خەڵکا نەدەما نەی دەزانی ئایا بە سەر شۆڕی بە خێوی بکات یا زیندە گۆڕی بکات ؟ ئەوەش خراپ ترین و نا بەجێ ترین شت بوو کە دەیان کرد بەرامبەر کچەکانیان •

پێنجەم :ـ ئیسلامی پیرۆز زیندە گۆڕی کیژۆڵەکانی قەدەغە کردوو بەهێزترین هێرشی بردەسەر ئەوانەی بەو کارە هەڵدەسن خوای گەورە دەفەرمووێ : ( واذا الموؤدة سئلت ، بلی

(١) الاحزاب : ئایەتی (٣٥) •

ذنب قتلت ؟ )[1] هەروەها دەفەرمووێ : ( قد خسر الذين قتلوا اولادهم سفها بغير علم )[2] •

شەشەم :ـ ئیسلام داوای ڕێز گرتنی ئافرەتی کرد جا ئەو ئافرەتە کچ بێ یاژن یادایك بێ :ـ

أ ـ ڕێزی کچی گرتووە پێغەمبەر دەفەرمووێ : ( ایما رجل کانت عنده ولیدة فعلمها فأحسن تعلیمها وادبها فأحسن تأدیبها ) •

ب ـ ڕێزی گرتووە لە زور ئایەتی باس کراوە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ : ( ومن آیاته ان خلق لکم من انفسکم ازواجا لتسکنوا الیها وجعل بینکم مودة ورحمة )[3] هەروەها پێغەمبەری مەزن دەفەرموێ ( خیر متاع الدنیا الزوجة الصالحة ، اذا نظرت الیها سرتك وان غبت عنها حفظتك )[4] •

ج ـ هەروەها ڕێزی دایکی گرتووە لە زۆر ئایەت و قسەدا باس کراوە ، وەکو یەزدانی گەورە دەفەرموێت ( ووصینا الانسان بوالدیه احسانا حملته امه کرها ووضعته کرها ) هەروەها پێغەمبەر دەفەرموێ ( دەست بەپێی دایکتان بگرن چونکە بەهەشت لە ژێر پێیەکانیەتی ) •

حەوتەم :ـ ئیسلام داوای فێر بوونی دەکات وەکو پیاو • • وەکو ووتەکەی پێغەمبەری مەزن ( ایما رجل کانت عنده ولیدة فعلمها

---

(١) الکورت : ئایەتی ٨ ، ٩ • (٢) الانعام : ئایەتی : ١٤٠ •

(٣) الروم : ئایەتی ٢١ •

فأحسن تعليمها ) هەروەها فەرمووده‌کەی : ( طلب العلم فريضة على كل مسلم (ومسلمة) ) •

هەشتەم :ـ هەقی میرات گرتنی هەیە جا ئەو ئافرەتە کچ بێ یا ژن بێت چ بچوك بێت ئەگەر لە ناو سکی دایکیشیا بێت •

نویەم :ـ لە تێکەڵاوی ژن و مێردایەتی دا وەکو یەکن تەنها دەبێ یەکێ سەرۆکی ماڵەکە بێت ئەوەش یەزدان دای ناوە کە پیاو بێت ، کەسێکیش وەکو خـوای گەورە لە کـارو باری بەندەکەی نازانێت ( ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف وللرجال علیهن درجة )

دەیەم :ـ لە مەسەلەی تەڵاق دانـی ئافـرەتەوە سنوورێکی تایبەتی داناوە کەکەسێ نەتوانێ وەکو ئەوانەی پێش ئیسلام یاری بە هەستی ئافرەت بکات ( وەکو لەمەو دوا باسی لێ دەکەین ) •

یانزەهەم :ـ لە ژێر سایەی ئیسلامدا پیاو ناتوانێ لە چـوار ژن زیاتر بهێنێ کەچی لەپێش ئیسلام و لەلایەن هەندێ لە گەلان ژن هێنان بێ ژمارە بوو •

دوانزەهەم :ـ پێش ئەوەی ئافرەت هەست و هۆشی پێ بکاتەو و لە منداڵیەوە لە ژێر سایەی گەورەکەی دەبێت بۆ ئاگـاداری کردنی و فێرکردنی خوورەوشتی جوان نەوەك بۆ ئەوەی دەست بە سەر ماڵ و سامانی بگرێت و بە هی خۆی دابنێ و پاش ئەوەی کچەکە گەورە بوو هەموو ماڵ و سامان و کار و باری خـۆی دەدرێتەوە دەست ، لە دەستی خۆی دەبێ •

# لەژێر سایەی ئیسلامدا ئافرەت جێگای خۆی گرتووە لەسێ ڕووەوە

یەکەم :ـ لە ڕووی مرۆڤایەتی ••• دان نرا بە بوونی وەکو ئادەمیزادێکی تەواو و هیچ جیاوازیەکی ناگرێ لەگەڵ پیاو •

دووەم : ـ لە ڕووی کۆمەلایەتی یەوە•••هەر لە منداڵی‌یەوە ڕێزی دەگیرێت و فێری خوێندن دەکریت و کەر بوو بە ژن تا دەبێ بە دایك ••• جێگای ڕێز لێ نانە ••• بەڵام کاتێ کە پیر دەبێ و لە دەست و پێ دەکەوێ دەبێ لە هەموو کاتێك زیاتر ڕێـزی لێ بگیرێت •

سێیەم :ـ لە ڕووی (ماف) ەوە :ـ خۆی خاوەنی تـەواوی ماڵ و سامانی خۆیەتی و مافی دەست بە سەرا گرتنی هەموو کار و باری خۆی هەیە کەس ناتوانێ دەست درێژی لێ بکات •

# ژن‌هێنان ئەركی سەرشانە لەئیسلامدا

ئیسلامی پیرۆز هاو سەری بە بناغەیەكی كۆمەلایەتی‌دا ناوەو بە رێگای خێروخۆشی و هاو دەمی و بەختیاری داناوە هەروەكو خوای گەورە ئەفەرمووێ ( ولقد ارسلنا رسلا من قبلك وجعلنا لهم ازواجا وذريه ) هەروەها پێغەمبەری مەزن ئەفەرمۆێ ( اذا تزوج العبد فقد استكمل نصف دينه ) هەروەها پێغەمبەر دیسان لەم بارەیەوە ئەفەرموێ ( ئەی كۆمەلی لاوان ئەوەی ئەتوانێ باژن بهێنی و ئەوەی ناتوانێ با بەرۆژوو بێت باشترە بۆ پاراستنی خۆی )[1] •

ئەو كەسەی بەبێ هۆ ژن ناهێنێ وەكو ئەو كەسەیە فەرمانێكی تەواو لەكۆلەگەكانی بناغەی ئیسلام بەجێ ناهێنێ ••• خوای گەورە لەزۆر ئایەت بێ هاوسەری بەكارێكی نارەوا دائەنێت وەك ئەفەرمووێ ( ورهبانية ابتدعوها ماكتبنا عليهم ) وەكو پێغەمبەر ئەفەرمووێ ( رەبەنی لە ئیسلام دانی‌یە ) •

گەران بە دوای چێژ وەرگرتن و دوور كەوتنەوە لە ژن هێنان و را كردن لە هەست بەلێ پرسینەوە ئەبێتە هۆیەكی گرنگ لە هۆیەكانی دواكەوتنی میللەتان و بەربەاد بونی رەوشتی‌پاك‌و خاوێن‌و دوورخستنەوەی گەنجان لەبەشدار بوونی خێروخوشی وولاتەكەیان‌و وایان لێ‌ئەكات تەنها بۆویستنی‌خۆیان كاربكەن‌و بوكەسانی‌تر خۆیان ماندوونەكەن وائەزانن ژن‌هێنان ئەیان بەستێتەوەو

ناتوانن بەویستی خۆیان لەهەمووشتێك وەربگرن زۆر لەزانە کۆمەڵایەتیەکان ئەم دوا ڕۆژە ڕەشەی لەئەنجام ئەم کارە ناڕەوایەیان بەدەرخستوە گرنگترین هوی دواکەوتن وونبوونی پەیوەندی‌یەکانی خێزانە ، وەکو چۆن ( ماریشال بیتان ) کاتێ ئەڵەمانیاهێرشی بردەسەر فەرەنسا بانگی خەڵقی فەرەنسای کردو ووتی بگەڕێنەوە ژیانی خێزان داری گوناهەکانتان پێکێشن ئەبینن چەندگرانن‌و زۆرن حەزتان بەمناڵ بوون نەکردو لەژیانی خێزان‌داری ڕاتان‌کرد بەدوای خۆپەرستیتان چیتان پێ‌ئەکات « باری ئابوری دەبێتە هۆی ژن نەهێنان » لەو سەردەمەی ئێستا کەتیای دائەژین زۆرترین کەسانی ئەم جیهانە بەدووای سامان کەوتون‌و هەموو هەوڵ‌و تەقەلایەکیان تەنها بۆئەوەیە بەسەر چاوەی ماڵ‌و سامان بگەن جا بەهەرچی جۆرێك بێت‌و بەهەرچی ڕێگایەك بێت بەلایانەوە بیان گەیەنەتە سەرچاوەی ماڵ‌وسامان ... چا خۆماندوکردن‌و گەڕان‌و شەونخونی بۆ گەیشتن بەم سەرچاوەیە .. لەزۆر شتی گرنگ‌یان دوور ئەکاتەوەو لەزۆر باوەڕی چاك‌و خاوێن لایان ئەدا زۆرترین ئەوکەسانە پەیوەندیان لەگەڵ یەزدان‌و دروست کەریان‌و سەرچاوەیان ئەبرێت‌و بێ‌هیوا ئەبن لە هەموو فەرامۆشیەك‌و ئارامێك تاوایان لێ‌دێت باوەڕیان بەخوای گەورە نامێنێت لەبیرو باوەڕی ئیسلام لائەدەن بۆئەوەی بەم ماڵ‌وسامانەیان بگەن کۆشك‌و تەلارو ئوتوموبیلی پان‌و درێژی پێ‌بکڕن‌و بەدەنگمەن یادی هەزاری ئەکەنەوەو ئاوڕێك لەهەژارەکان ئەدەنەوە یانا تاوایان لێ‌دێ دزی

خوای خۆیان ئەوەستن‌و تەپلی جەنگ لەگەڵیا لێ‌ئەدەن بەنەدانی زەکات بەهەژارەکـان .. جا ئەم جۆرە کەسانە کـچ بەشوودانیشیان کـردۆتە ڕێگایەك بۆ گـەیشتن بەسامان کاتـێ گـەنجێك ئەیـەوێ کچێك بخوازێت لەخێزانێك هەژارەها کوسپ‌و مەرجی گرانی ئەخەنە بـەردەم .

ئەم جۆرە مەرجانە بریتین لەنەخۆشیەکـانی دەروونی ترسنـاك نەوەك هـەرئەم هاوسـەری‌یە تێـك ئـەدەن بەڵکـــو بەشێکـی زۆر لەمرۆڤایەتیان وون ئەکەن هەروەها ئەو کەسانەی ژن ناهێنن‌و حـەز بەهاوسەری ناکەن‌و بەدوای بەدڕەوشتی‌و پول کۆکردنەوە کەوتوون ئەبنە هۆیەك لەهۆیەکانی ڕوخاندنی شارستانیـەت ئادەمیزاد لەسەری پێویستە چ بەهەژاری یا بەدەوڵەمەندی ڕێگای ژیان‌و وەپێشکەوتنی لەخۆی نەگرێت چونکە ئەم ژیانە هەمووی چـەند ڕوژێکـە بەسـەر تەمەندا ئەڕوات یا ئەو تۆ بەجێ ئەهێڵی یاتۆ ئەو بەجێ ئەهێڵی چ بـە دوای تەمەن چ بەدووای جیهان هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ (وتلك‌الایام نداولها بین‌الناس) هەروەها قورئانی پیروز هەر لەسەرەتای ئیسلامەوە بەم دەردەی زانی چارەسەری کرد :ـ ( وانکحوا الایامـی منکم والصالحین من عبادکم وامائکم اذ یکونوا فقراء یغنیهم الله مـن فضله ) داوای لەو کەسانەی کرد لەبەر هەژاری ژن ناهێنن ژن بهێنن چ لە ئافرەت بەندەکان یان ئازادەکان وە لە هەژاری مەترسن وە خوای گەورە دەوڵەمەنتان ئەکـات وە بە هـەژاری ناتان هێلیتـەوە ئەمەش

خوشترین مزگینی‌یە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخوا هەیە کەوا وادەی خوا ڕاستە و دێتە جێ هەر وەکو ئەبوکری جێنیشینی پێغەمبەری مەزن ئەفەرموێ « ئەوەی خوایێ فەرموونە بەجێی بهێنن لە ژن هێنان •• ئەوەی خوا وەعدەی پێ داون دەی هێنێتە جێوە دەولەمەنتان ئەکا » •

ئیسلامەتی ڕێگای پاك و چاك نیشانی ئادەمیزاد ئەدات وە داوای کومەڵێکی خاوەن باوەڕ ئەکات دژ بە کومەڵگای شەیتان ئەوەستێ هەر وەکو خوای گەورە ئەفەرموی ( الشیطان یعدکم الفقر ، ویأمرکم بالفحشاء واللّه یعدکم مغفرة منه وفضلا واللّه واسع علیم )[1] •

ژن هێنانی و شوکردن هەر لە سەرەتای پەیدا بوونی ئادەمیزاد وە گەشەیە کردنیەوەدروست بووە حەز بە یەکتر گەیشتنی ئافرەت و پیاو ئەکات بەم ڕێگەیە پیاویش یەکەم هۆبوو بۆ بەیەك گەیشتیان••• ژن هێنان یا شووکردن یاسایەکی ئەزەلی‌یە بۆ زور بونو گەشە کردنی ئادەمیزاد و بونی وەچە ( النسل ) کە هۆیەکی ئەم بەیەك گەیشتنەیە ••• جا بۆئەوەی ئەم وەچەیە لە ڕێگایەکی ڕاستەوە بێت لە باوەشی دایك و باوکی ڕاستەقینە و میهرەبان پەروەردە بێت ئەبێ ئەم بەیەك گەیشتنە پەیوەندیەکی دیار کراو بێت بزانرێ ئەم منالە لە چ سەر چاوەیەکە چ ئافرەت و چ پیاو حەز بە کاری سیکس ئەکەن هەروەکو هەموو ئاژەڵەکانی‌تر بەڵام ئەم کارە یا ئەم بەیەك گەیشتنە

(۱) البقرة الآیة ۲۶۸ •

ئەبێ یاسایەکی تایبەتی هەبێت هەروەکو یاساکانی تر کە بە درێژایی ژیانی ئادەمیزاد چ لە ناوەوەی ئادەمیزاد چ لە دەرەوەی بەرە چەسپاوە ... چ یاسایەك هەیە جوانتر لە یاسای هاو سەری بۆ یەك گەیشتنی ئافرەت و پیاو کە لە پاڵ کاری سێکس خوشەویستی باوەشیان پیا ئەگرێتەوە بەو ڕادەیەی خێر و خوشی و تاڵ و ترشی بەیەکەوە ئەبەنە سەر ... جا با شترین ئافرەت ئەو ئافرەتەیە ئەم بارەیان یا ( الجو )ە بۆ ماڵو منداڵی برەخسێنێ ، خۆشەویست ترین پیاو ئەو پیاوەیە خوشەویست ترین ئافرەت بەلایەوە ژنەکەی بێت پاش خوشەویستی دایك .

## أ ــ هاوسەری ودەولەمەندی :ــ

ئادەمیزاد هەر کاتی نەزانی و بێ هەستی ڕووی تێ کرد لە ڕێگای ڕاست لا ئەدات و ڕێچکەیەکی تر ئەگرێت وا ئەزانێت بەم لادانە ڕێگای ژیان خوش ئەکات ... حەز ئەکا پیاوێك بکاتە هاوسەری کە خاوەنی سامانو دارایەکی زۆر بێت بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە ئایا لە دوا ڕوژ یا لەو ڕێگا درێژەی بەردەمی ئەتوانی کاروان بگەیە نێتە جێ بەدڵێکی خۆشو بەختیارانەوە و کامەران بژیت وە چ ئافرەت ئەتوانی لەگەڵیا ئەم ڕێگایە درێژە ببرێت لەکاروان دوا نەکەوێت هەروەکو پێغمبەری مەزن ئەفەرموێت ( لا تزوجوا النساء لاموالهن فعسى اموالهن ان تطغيهن )[1]

---

(١) ابن ماجە و بەیهەقی ئەی گێڕنەوە .

## ب ـ ئافرەتو پایەبەرزی

زۆرکەس هەیە حەز بەدەستەلاتداری و گەورەیی ئەکات بەدووای هاوسەرێك ئەگەڕێت بەرزی بکاتەوە لە جیهان بەلام پێغەمبەری مەزن هەرلە زووەوە ئەوکەسانەی دەست نیشان کردووە کە هەرکەسێ بەدووای گەورەیی لە دوونیا بگەڕێت نزم تر ئەبێت ( من تزوج امرأة لحسبها لم یزده الله الا الدناءة )

## ج ـ هاوسەریو جوانی :ـ

کەسانی تر هەن تەنها خەمی ئەوەیانە بەچێژە تاژەلیەکەیان بگەن بەدووای هاوسەرێك ئەگەڕێن کەخاوەنی سەرو سیمایەکی جوان بێت بەتایبەتی چینیپیاو بەدووای چاوگەشو پرچی خاوو بەژنو بالای شمشالی ئەگەڕێن ئافرەت بەپێی جوانیەکەیان هەلئەسەنگێنن وەکو چۆنشت سەودا ئەکەن لەبازار ئەمەیان لەبیرا نایەت کەوا ئافرەت پێش هەموو شتێك ئادەمیزادە جوانترین شت لەئادەمیزاد دا مرۆڤایەتیەکەیەتی یان ئاینەکەیەتی بیروباوەڕەکەیەتی خوڕەوشتو سیفاتی جوان یەتی ئەگەر لەم شتانە بەشدار بوو ئەوە بێشك لەدلو دەرونی هەموو کەسێك جێگاو پایەی دیارکراوی ئەبێت ... ئەگێڕنەوە جارێك یەکێك هاتە لای پێغەمبەرو ووتی ئەی پێغەمبەری خوا چ ئافرەتێك باشەبۆ ئەوەی بیکەم بەهاوسەرم ئەویش لە وەلاما فەرمووی : داوای ئافرەتی خاوەن ئیمانو

باوەڕبکە ( اظفر بذات الدين تربت يداك )[1] جارێکیتر یەکێـك بە پێغەمبەری گوت ئەمەوێ ژنێك بێنم و خاوەنی جوانیەکی زۆرە •

بەڵام منالی نابێت پێغەمبەر فەرموێ ( مەی هێنـە ) جـارێکی تریش هاتەوە پێغەمبەر هەرپێی فەرموو ( نەخێر مەی هێنە ) جارێکی تر کابرا هاتەوە پێغەمبەر فـەرمووی ئافرەتێ بهێنە خـۆش ڕوو و میهرەبان بێ‌و منالی ببێت من‌شانازی بەزۆریشـان ئەکـەم ( تزوجـو الودود الولود فأني مكاثر بكم )[2] •

## ( چ ئافرەتێك هەڵئەبژێت )

هاوسەری بەیەك گەیشتنی سیفات بەسیفات‌و کیان بەکیانە بۆیە ئەبێ‌بەردی بناغـەی یاسـای هـاوسەری خـۆڕەوشت‌و ئاین بێت ئەوکەسەی خۆی بەخاوەن باوەڕ ئەزانیت نابێت هاوسەرێك بگرێت لـە ئاین‌و خـوو ڕەوشتـی بێ‌بەش بێت و •• هیـچ کـارەساتێـك تووشی‌خێزانـی موسلمان نایەت گەورەتر لـەو کارەساتەی کـەوا هـاوسەر بەپێی ماڵ‌و دارایی‌و گـەورەیی‌و جێ‌نیشینی ڕەگـەزو ڕەنگ هەڵبژێرێت مەزن‌ترو باڵاتر ئەو کەسە نیە کەوا ئەو سیفاتانەی سەرەوەی هـەبن بەڵکـو بەڕێزی گـەورەی پایە بەرزی مـرۆڤایەتی بەو پێیە داناوە کەلای خـۆی پایەداربێت • ان اکـرمکم عنـد الله

(۱) بخاری ومسلم ئەگێرنەوە •

(۲) ابو داود ونسائي ئەگێرنەوە

اتقاکم » ئەوکەسەی خۆڕەوشتی جوانی هەبێت ڕۆشنبیری ئاینی بەرزو قوڵی هەبێت ڕێزی خۆی لابێت ئەمە بەسە کەببێ بە هاوسەری هەر ئادەمیزادێك چ ئافرەتو یا پیاو یا لەچ دەنگێك و ڕەگەز بێت ... هەر لەم ئاسۆیە پێغەمبەری مەزن ئەفەرموێت گەر یەکێکتان هاتە لا لە ڕەوشتو ئاینەکەی ڕازی بوون هاوسەری بۆ پەیدا بکەن گەر واتان نەکرد بەدڕەوشتی و کێشەو ئاژاوە ڕوو لەجیهان ئەکات ( اذا جاءکم من ترضون دینه وخلقه فزوجوه الا تفعلوا تکن فتنة فی الارض وفساد کبیر )[1] .

ئافرەت مافی ئەوەی هەیە هاوسەر بەخۆی هەڵبژێرێت گەر کچ بێت یا بێوەژن هەموو سەربەستێکی ئەبێ هەبێ بۆ هەڵبژاردنی ئەوەی دەیەوێ یا نایەوێ...هیچ کەسێك خۆ سەپاندنی بەسەریانی‌یە نەباوکی نە ئەو کەسەی سەرپەرشتی ئەکات «بەمەرجێ کوڕەکەلەخوو ڕەوشتاو پلەی ئاینەوە لەگەڵ ئافرەتەکە » یەکسان بن پێغەمبەری مەزن ئەفەرموێ : بێوە ژن مارە ناکرێ تا بڕیار نەداو کچیش تابڕیاری لێوەر نەگیرێ « لاتزوج الایم حتی تستأمر ، ولا البکر حتی تستأذن »[2] .

بێدەنگی کچ نیشانەی بڕیاردانی‌یەتی ... گەرچێ بە نادڵی و بەزورێ مارەکرا دەستەڵاتی ئیسلام نەتوانێ هەڵی وەشێنێتەوە .

(۱) ترمذی ئەگێڕێتەوە .

(۲) بوخاری وموسلم ئەگێڕنەوە .

وەکو ئەگێرنەوە (خەنسای کچی خەدام) بێوەژن بوو باوکی بەزۆری دای بەپیاوێك و ڕقی لێبوو ئەمیش هاتەلای پێغەمبەر (د٠خ) بڕیاری لەسەر مارەکردنی نەدا لەوپیاوە جارێکیتر کچێك بەشوودرا هاتەلای پێغەمبەرو ووتی : (باوکم منیداوە بەبرازاکەی کەمن حەزی لێناکەم) پێغەمبەر فەرمووی (چ حەزئەکەی مارەیی‌یەکەت هەڵبوەشێتەوە یاحەز ئەکەی‌وابمێنی بڕیاریش بڕیاری خۆتە) کچەکە ووتی نامەوێ دڵی باوکم بشکێنم وا دەمێنم بەلام بۆیە شکاتم لەلات کرد تاکو هەموو ئافرەتان بزانن کە ئافرەت بڕیاری خۆی لەدەستی خۆیەتی)[1] •

## (مافی مێرد لەسەر ئافرەت)

وەکو لەپێشەوە باسمان کرد کە چۆن ئافرەت مافی لەسەر پیاو هەیەو لەسەر پیاو پێویستە ئەم مافانەی بێنێتە جێ بەم جۆرەش مێرد مافی لەسەر ئافرەت هەیە هەر کەس بەپێی جێگەو شوێنی تایبەتی خۆی لەژیاندا ••• جا بۆ ئەوەی ئەم ژیانە بەکامەرانیو شادی بچێتە سەر لەسەر هەردوولا پێویستە یەکتر لە مافەکانیان بێبەشی نەکەن •••

أ ـ ئەبێ ئافرەت گوێڕایەڵ بێت هەرکاتێ مێردەکەی داوا کاریەکی لێ کرد بەتایبەتی سەرجێگایی •• هەر ئافرەتێ سەرپێچی

(١) ئەحمەد ونسائی وابن ماجە ئەگێرنەوە •

کرد یانی سەرپێچی لە بڕیارەکانی خواوپێغەمبەر ئەکات هەروەکو پێغەمبەری مەزن (ص) ئەفەرموێ :ـ ( ئەگەر مێردێ داوای لەژنەکەی کرد بۆ سەرجێگایی‌و بەگوێی نەکردو بەنادڵی خەوتن تا بەیانی فریشتەکان نەفرەتی لێ‌ئەکەن )[1] تا ئافرەت نابێ ڕۆژووی سوننەت بگرێت بەبێ ئاگاداری مێردەکەی وەکو پێغەمبەر فەرموێ [ لاتصوم المرأة وزوجها شاهد یوما من غیر رمضان الا بأذنه ][2] •

ب ـ هەر کاتێ مێردەکەی لەماڵو خێزانەکەی دوور کەوتەوە لەسەر ئافرەتەکەی پێویستە ئاگاداری ماڵو منالەکانی بکات بەدڵپاکیەوە هەروەکو پێغەمبەر لەباسی ئافرەتی ڕەوشت پاك ئەفەرموێ •

[ ان زوجها غاب عنها نصحته فی نفسها وماله ][3] •

جوانترین شتێرە ئەمەیە کەوا ئیسلام ڕێگای ئافرەتی داوە لەماڵی مێردەکەی خێر بکات بەلاّم ڕێگای پیاوی نەداوە لەماڵی ژنەکەی خێربکات وەکو پێغەمبەری مەزن ( د•خ ) ئەفەرمووێ ( اذا انفقت المرأة من بیت زوجها غیر مفسدة له کان لها اجرها وله

---

(١) ئیتفاقیان لەسەر کردووە ( متفق علیه ) •

(٢) هەرپێنج ئەگێڕنەوە تەنها نسائی نەبێ •

(٣) ابن ماجه ئەگێڕنەوە •

مثله بما كسب )[1] •

له سەر ئافرەت پێویستە هیچ کەسی نەهێنیتە ماڵەکەی کەمێردەکەی حەز بەچارەی ناکات وەکو پێغەمبەر لەحەجی ماڵ ئاوایی فەرمووی : ( ان لكم على نسائكم حقا ••• ولنسائكم عليكم حقا فأما حقكم على نسائكم ، فلا يوطئن فرشكم من تكرهون ولا يأذن في بيوتكم لمن تكرهون )[2] •

بەلاَم کەسێك کەمێردەکەی دڵی لێ ئەمینەوخۆشی ئەوێت هیچی تیا نی یە گەرئافرەتەکەی بەخێر هاتنی کرد بەڵکو بەبێ ئەویش ڕێزیی بگرێت •

## بناغەی هاوکاری لەژیانی هاوسەرایەتی

[ ومن آياته أن خلق لكم من انفسكم ازواجا لتسكنوا اليها ، وجعل بينكم مودة ورحمة ، ان في ذلك لآيات لقوم يتفكرون ] • لەکۆنەوە ئەیان ووت ئافرەت گیان لەبەرێکی نەفرەت لێ کراوو بێ گیانە ••• لەکونگرەی فەرەنسادا لەسال ( ٥٨٦ ) ویستیان ڕێزی بنێن ••• بەهەمموو تەقەلاَ یەکیان ئەمو ساتە بڕیاریاندا کەوا ئافرەت ئادەمیزادەو وەکو گیان لەبەرانی تر نی یەو بۆ ڕاژەی پیاو دروست بووە ••• ئەگەر لەگۆشەی ئەمیاسایە

---

(١) هەموویان ئەگێڕنەوە ( رواة الجماعة )

(٢) ابن ماجه وترمذی ئەگێڕنەوە

توندوتیژانەوە سەیری ئەم ئایاتەی سەرەوە بکەین ڕاستی ئافرەتمان بۆ دەرئەکەوێ و چ پایەکی بەئافرەت داوە ... ئەمانە چەند ئایەتێکن لە قورئانی پیرۆز ئەفەرمووێ چۆن پیاو دروست بوو ئەویش بەم جۆرەو دروستی کردووە بۆئەوەی ببێتە هاوسەری پیاوو نیوەکەی تری تەواو بکات « ومن آياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجا » خوای گەورە ئەم ئافرەتەی بۆیە درووست کردووە تاوەکو ئادەمیزادێکی دڵسۆز یارمەتی پیاوەکەی بدات و دڵو دەروونی فێنك بکاتەوەو نەختێك لەماندوو بوونی ڕۆژانەی کەم بکاتەوەو جیهانێکی پڕ لەکامەرانی بۆ خێزانەکەی بنیات بنێت و مێردەکەی لای بسرەوێ.. سرەوتن شتێکی دەروونی یەو نهێنێکی ویژدانی یە کە پیاو لای ئافرەت نەبێ بەهیچ جێگایەك دەستی ناکەوێت و سرەوتن لەپێویستیەکانی دەروونیو ناوەوەی مرۆڤە .

خوای گەورە بەهەر یەکێکیان لەئافرەت و پیاوەکە نهێنی بەخشیووە کە هەردوکیان بەرامبەر بەیەکتر میهرەبان بەزەیی و بەخشندە بن ( وجعل بينكم مودة ورحمة )[1] ... لێرەوە ئیسلام ڕاستی ئافرەتمان بۆ دەرئەخات کەوا هەمووشتێکی چاکەیەو وەکو پیاو گەر جوان پێ بکات دوورە لە شەڕ ( ولهن مثل الذي عليهن بالمعروف ، وللرجال عليهن درجة ) .

---

(١) الروم : ٢١

ئەم ئایەتە پیرۆزە وا ئەگەیەنێ کە :ـ

أ ـ ئەم ئایەتە پیرۆزە تەرازووی یەکسانی لەنێوان ئافـرەتو پیاو نیشان ئەدات ئافرەتو پیاو هەریەکەیان خاوەنی مافن بەسەر یەکترداو هـاو سـەری‌دا نابـێ هیـچ کامێکیـان دەسـت درێـژی بەسەر مافەکانی ئەوی ترا بکات •

ب ـ یەکسانی (مبدأ ئێکە مافو فەرمانەکانی لە نێوانی

مێردان دابەشی ئەکات ( ولهن مثـل الـذی علیهـن ) یەکسانی تەنها لە جلو بەرگ و خواردن نی‌یە تەنها بەڵکو لە هەموو شتێکا تا لە هەڵسانو دانشتنا بەپێی دانانی پەیرەوی ئیسلام (عەبدوللا کوری عەباسی ) ئەفەرموێ [ چۆن خێزانەکەم خۆیم بۆ جوان ئەکات منیش بەم جۆرە خۆمی بۆ جوان ئەکەم ] •

ج ـ جورێکی تر لە مانای رەوانی یەکسانی لەهەموو شتێکـدا یەکتر وەرگـرتنە پرسـی بـە یەکتر کـردنە لە کـاروباری ژیـانو چارەسەر کردنی کێشەکانی خێزانو مشوری خواردنی منالەکانیان هەروەکو لەم ئایەتە باسی پرس بە یەکتر کردن ئەکا :

( والولدات یرضعن اولادهن حولین کاملین لهن اراد ان یتم الرضاعة فان ارادا فصالا عن (تراض) منهما و ( تشاور ) فلا جنـاح علیهما ) •

# پلەی پیاو بەسەر ئافرەتەکەی
# « للرجال علیهن درجة »

ئیسلام بۆ هەموو شتێك نەخشەیەکی تایبەتی ئەکێشێت باسی سنوورو نەخشەی ئیسلامەتیمان کرد لە دابەشی کردنی ماف و فەرمانەکاندا بە جوان ترین شێوەی دادپەروەری‌و یەکسانی بەلام لێرە بەس ئەوە ماوە کە پرسیار بکەین ••• کە ووتمان خێزان دەولەتێکی بچوکە پێویستی بە سەرۆك بە رێوەبەرایەتی هەیە جا ئایا کێ ئەبێ سەرۆکی خێزان بێت پیاوەکە یاخود ژنەکەی خوای گەورە بە پێی ئەم ئایەتە سەرۆکایەتی داوە بە پیاو :

( للرجال علیهن درجة ) ئەمەشی جوانترین نیشانەی عەقل‌و سروشتی هەموو شتێکە ••• پیاو باوکی منالانە •• منالەکان بەوەوە ئەناسرێن ••• گەر باوك پێش لە دایك بوونی کوڕەکەی بمرێت لەدوا رۆژدا منالەکە هەر بەوەوە ئەناسرێت ••• لە هەموو بارێك دا هەر پیاو لێ پسراوە بەرامبەر بژێوی خێزانەکەی لەو کاتەی بەرێوە بردنی مالەکە لەسەر ئافرەتەکەیە پیاو رێکخەرە خاوەنی خانووو بەرەیە پاراستن‌و ئاگادارکردنی‌و کارکردنی لە دەرەوە بۆ بەڕێوەبردنی لەسەر پیاوە ••• ئەم سەر کردایەتی‌یە سەرکردایەتی هەست بە لێ پرسینەوەیە نە وەك سەرکردایەتی دەسەلات داری •• ئەم سەرکردایەتی‌یە هەمووی ئازارو بار گرانی‌و ئەشکەنجەیە •• وە ئەو کەسەی کاروباری دەرەوە بکات‌و بە پاراستنی مالەکە

هەلسێ لە هەر هێرشێکی خراپە کەرانو ئەو کەسانەی نەخۆشیان لە دلایە [ الذين في قلوبهم مرض ] بۆیـان نی‌یە بەبێ ئاگـاداری پیاوەکە یاخود ئاگاداری هەردوولا بێنە مالەکە [ لاتأذن المـرأة في بيت زوجها وهو شاهد الا بأذنه ][(١)] .

لە ڕوالەتەکانی ئەم پلەیە یا ئەم سەرۆکایەتی‌یە ئەوەیە کەوا ئافرەت لە مالی باوکی ئەچێتە مالی مێردەکەی ... ئەو مالەی بـە هەزار ئازارو ئەشکەنجە پێکەوەی ناوەو ئەبێتە جێ‌نشینی هەردوولا یان ... وەهیچ کاتێك نابێ ئافرەتەکـە داوا لـە مێردەکەی بکـات کەوا خانووەکەی لـە شارێکی تایبـەتی بێت یا لـە گەڕەکێکی یـا شەقامێکی تایبەتی بێت ئەوە بە پێی تـوانای پیاوەکـە ئەبێت و نابێ زۆری لێ بکرێت .. ئەمە شتێکی ڕەوایە کە هەر ئافرەتێکی خاوەن ڕەوشتی بەرزو پیرۆز حەز بە تەنگ هەلچنینی پیاوەکەی ناکات ... سەرۆکایەتی بە کەسێك ئەدرێت کە پسپۆری لە کاروباری سەرەکی وتایبەتی بۆ بەرێوەبردنی مالەکە هەبێت ... ئەو سەروکایەتی‌یە بە مانای نەهێشتنی هەستو وبیستی ئافرەتەکە نایەت ... ئـەم سەرۆکایەتی‌یە نابێ ببێتە هۆی پەیدا بوونی هیچ دژایەتیەك لـە نێوان هاوسەران ... ئەوەی لە نێـوان هاوسەران دا هـەیە زۆر بەرزو پیرۆز تـرە لـەو جـۆرە شتە ساکارانە ئـەم سەرۆکایەتی‌یە خـۆشەویستی‌و بەخشندەیی‌و میهرەبانی ئەی گرێتەوەکـە دووری

(١) موسلیم وبوخاری ئەی‌گێڕنەوە .

ئەکاتەوە لە سەرۆکایەتی دەسەلات داریتی بە سەر چەندانی تردا ..
ئەوەشی دیارە کە هیچ کارگە و دەزگایەك بێ سەرۆکایەتی بەرێوە ناچێ ...

هەلسانی پیاو بەسەر کارو و باری ئافرەتدا [ الرجال قوامون علی النساء ] ئەم پلە سەرۆکایەتی‌یەی ئیسلام بریاری داوە بەرامبەر بە ئافرەت لە دەسەلاتی ئەم ئایەتەیە [ الرجال قوامون علی النساء ... بما فضل الله بعضهم علی بعض ][1] .

ئەم ( هەلسانەی ) ش دوو جۆرە :ـ

أ ـ جۆری کەرەستەیی هەستی ( المادی الحسي )

ب ـ جۆری وورە ( المعنوی )

جۆری مادی ئەوەیە کەوا پیاوەکە هەلبسن بە پەیدا کردنی خواردەمەنی‌و پێخەفو جل‌وبەرگ‌و پێویستیەکانی تر .. لە فەرهەنگی زمان واهاتووە گەر بلێن ( پیاوەکە بە ئافرەتەکە هەلسا) یان پیاوەکە بە کاروباری ژنەکە هەلسا ... ئەوەشی تەنها لەبەر ئەوەیە ئافرەتەکە لەبەر هەندێ کارو پیشەی تر کارە پیویستیە کە ئەنجام نەدرێ .. ئەم کارو پیشانەش وەك سك کردن‌و منال بوون‌و شیردان‌و پەروەردە کردنی منال کە ئەبێتە هۆی وەستانی ئافرەت بۆ ماوەیەك لەکارو پێشەکەی ... جا لەسەر پیاوەکە پێویستە ئەبێ

(١) سوورتی النساء : ٣٤

کاروباری دەرەوە بگرێتە ئەستۆی خۆی .. هەندێ جار کاری ناو مالیش ئەوە هەر لە مالەوە وانی‌یە بەڵکو تا ئەو ئافرەتانەی لە دەسگاکانی میریش کار ئەکەن ... بۆ چەند مانگێك دەست لەکار ئەکێشنەوە بەهۆی منال بوون . . یانی لە دایرەکانیش بۆ چەند مانگێك ئەبێ پیاوەکان کاروباری ئافرەتە منال بووەکان ئەنجام بدەن .

بەلام جۆری (معنوی) و ڕەوشتی و ئەدەبی کە ئەچێتە پال مانای ئایاتە پیرۆزەکە [ الرجال قوامون علی النساء ] ئەمە وا ناگەیەنێ کەوا ئافرەت بێ دەسەلاتە و بێ وورەیە یاخود بەم جۆرە کارانە ناشێ بەڵکو کێشە کێشەی دابەشی کردنی کارو پیشەیە بە جوانترین ووردترین شێوە بوی بەرێوە بردنی کاروباری خێزان .

ئیسلام ڕێگای بە ئافرەت داوە کە لە کاتی نەبوونی کەسێك بە کاروباری دەرەوەی هەلسێ ... خۆی پێی هەلبسێ خۆی بەشداری کرین‌و فرۆشتنی‌و بەکرێ دان بکات‌و ئەتوانێ لە دادگای ئیسلام بەرگری لە مولك‌و مالی خۆی بکات لەو کەسانەی ئەیانەوێ دەست درێژی بۆ مالی ئەو بکەن جا ئەو کەسە هەر کەسێك بێت ... لەمەشی گرنگ تر گەر کابرایەکی موسولمان ژنێکی دیان یا جوولەکەی مارە کرد بۆی نیە زۆری لە دین دا نی‌یە [ لا اکراه فی الدین ] بەڵکو ئافرەتە نا موسولمانەکە ئەتوانێ مال‌و منالی خۆی

بەڕێوە بات و هەر لەسەر دینەکەی خۆش بێت هەروەکو خـوای گەورە ئەفەرموێ : [ اليوم احـل لكم الطيبات ـ والمحصنات مـن المؤمنات والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم اذا اتيتموهـن اجورهن محصنين غير مسافحين ولا متخذي اخذان ][1]

چاو پۆشی لەسەر کردایەتی ئافرەت بۆ زۆرەها کارو پیشەی وەك سەر کردایەتی لەشکر کراوە لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە :

أ ـ تووش بوونی ئافرەتو بە تووش ( حەیز ) جار دوا جارو هەڵگرتنی سكو منال بوونو شیردانی منـاڵو شەونخونی مانـدوو بوونی ڕۆژانەی کە ئەبێتە هـۆی لاواز بوونیو بێهێزی توانـای ئەوەی نابێ کارو پیشەی سەرەکی بگرێتە ئەستۆی خۆ ..

ب ـ کارو پیشەی ناو مال کە ئافرەت بەڕێوەبەری مالەکە یـە ئەتوانێ بەڕێـك و پێکی پـێی هەلسێ چـونکە ئـەو ئاسۆیە لـەو پەڕی فراوانی دا نی‌یە بەلام کارو پیشەی پیاو لەدەرەوە وای لـێ ئەکات ئاسۆیەکی فراوان بۆ خۆی پەیدا بکات .. بەهۆی پەیوەندی زۆری لەگەل کەسانی جۆراو جۆری بازارەکان و هەلسان دانیشتنی سروشت لەگـەل کـەسانی جـۆراو جۆر بەهۆی ئەو شارەزایی‌یە ئەتوانێ لە بازارو دانشگاکان خۆی لە جۆرەها فروفێلی هەرزەکاران دەر باز بکات .

(۱) المائده (٥) .

ج ـ ئافـرەت پێویستی بـە ئـارامو لە سەرخۆو ڕوو خۆشو هەستو سۆزی نەرم هەیە بۆ ئەنجام دانی پیرۆزترین و بەرزترین کارە سەرەکیەکانی خـۆی لەپێش هـەموویان پەروەردە کـردنی منال ••• ئافرەت بۆ پێ گەیاندنی ڕۆڵەکانی ئەبێ سۆزو هەستێکی ناسکی هەبێ و ئەبێ بە هەستو بیرو مێشک ڕۆڵەکەی کـار بکات تاکو لە کۆسپو دوو دلی و گرێ دەروونیەکان دووربێتەوە •• لەو کاتەی پیاو پێویستی زۆری بەهێزو توندیو ئارەزوو هێزی ویستی خۆی هەیە جگە لە بیر تیژیو ڕاست بۆ چوونی کارەکانی ڕۆژانـەی •

ئەبێ ئافرەت ڕاست گۆ بێ لەگەل خۆیا بە ووتـەی بەرەللاو حەز پەرستەکان دژی ویستی خوای گەورە نەوەستن ••• چـونکە خوای گەورە لەهەموو بەندەیەك زیاتر لە دلو دەروونیو کـارو پیشەی کەسانو بەندەکانی خۆی ئەگات •• خوای گەورە نایەوێت دلو مێشکی ئافرەت ماندوو بکات کە بە کارو پیشەی ناو مالو منال پەروەردە کردنو سك کـردنو منال بوون هـەلبسێتو کـاری دەرەوەش بکات ئەبێ هەریەکێکیان بکات بەلام ئایا ئەتوانێ واز لە دایکایەتی بهێنێ •

## بژێوی ئافرەت ( النفقه )

گەر ژنێ شووی کردو هەرچەندە خاوەنی مالو دارایی بێت بۆی هەیە خەرجی یا مشووری مالو منالی نەکێشێت گەو بە دلی خۆی

نەبێ بەڵکو لەسەر پیاو پێویستە تێ بکۆشێ بۆ ئـەوەی منالەکـانی رووتو برسی نەبن ، وە لەکاتـی بەستنی پەیوەنـدی مارەکـردنی ئافرەت لەسەر پیاو پێویستە بەڵێن بـدات بـە تێکوشان لە پێنـاوی بژێوی منالەکانی ... جێگاو کەلو پەل و خـواردنو جلو بەرگ بۆ زنەکەی ئامادە بکات وەکو پێغەمبەر ئەفەرموێ ، [ ولهن علیکم رزقهن وکسوتهن بالمعـروف[1] وە هـەروەها خـوای گـەورە ئەفەرمووێ :ـ

[ اسکنوهن من حیث سکنتم من وجدکم ] ـ الطلاق ـ ٩ .

وە بوونی جێگاو کـەلو پەل بەپێی توانا ئەبێت وە ئەگـەر پیاوەکە توانای هەبێ ئەبێ هەموو شتێك ئامادە بکات [ لینفق ذو سعـه من سعته ومن قدر علیه رزقه فلینفق مما آتاه الله[1].

## بەباشی ڕەفتار کردن لەگەڵ ئافرەت

لە بارەی رەفتـاری باشی لەگـەڵ ئافـرەت خـوای گـەورە ئەفەرموێت :ـ (عاشروهن بالمعـروف)[2] دیسانـەوە ئەفەرموێ : [ ولا تضاروهن لتضیقوا علیهن ][3] خـوای گـەورە سنوورێکی

---

(١) موسلیم و ئەبو داود ئەگێرنەوە .

(١) الطلاق ـ ٧

(٢) النساء ١٩ .

(٣) الطلاق ـ ٦ .

تایبەتی بۆ گۆرە پانێکی پان‌و بەرین داناوە بۆ جوولانەوەی لەگەل ئافرەت ••• بەجۆری چۆن ئادەمیزادێکی ڕەوشت بەرز رەفتار لەگەل ئادمیزادێکی تردا دەکات نەوەك ڕەفتاری ئادەمیزادێك لەگەل بەندەیەك ••• ئەبێ ڕەفتار لەگەڵیا لەو پەڕی ڕوو خۆشی‌و دلدانەوە دڵخۆشی‌دا بێت بەو جۆرەی ئەو ئافرەتە هەست بکات لە زیان دوورەو لە کامەرانی دایە نابێ جیهانی فراوانی لێ تەسك بکەینەوە ـ ئەو پیاوەی بە پێی دانانی خوای گەورە لەگەل هاوسەرەکەی جولایەوە ئەوە موسولمانی تەواوە و رێگەی راستی یەزدانی گرتووە پێغەمبەر ئەفەرموێ [ باشترین کەستان باشترین کەسە بۆ هاوسەرەکەی ][1] وە دیسان ئەفەرمووێ : [ باشترین کەستان باشترین کەسە بۆ خێزانەکەی و من باشترین کەسم بۆ کەس و کارم ][2] زۆر لە نەزانەکان‌و بێ مێشکان ئازاردانی ئافرەت لە بەشێك لە پیاوەتیان دائەنێن ••• یارمەتی دانی هاوسەرەکەی و کە لەگەڵیا بەخۆشی جولایەوە خۆی بەبێ دەسەلات ئەزانێ ، وەهەندێ پیاوی تر خۆ لاوازی ( ضعف الشخصية)ی خۆی بەم جۆرە کردارانە ئەشارێتەوە•••هیچ کەسێ لە

---

(١) ئەحمەدو ترمذی ئەگێرنەوە

(٢) ترمذی ئەگێرنەوە •

پێغەمبەری مەزن داناتر نەبووەو بە باشترین شێوە ڕەفتاری لەگـەڵ هاوسەرەکانی کردوە نابێ لە ژنەکەت دوو دڵ بیت‌و بە دزیەوە لێی بچیتە ژوورەوە پێغەمبەری مەزن ئەم کردارانەی قەدەغە کردووە ... ( جابر ڕەزای خوای لەسەر بێت لە پێغەمبەر ئەگێڕتەوە کـە خۆحەشاردان‌و بەشەوانی درەنگ هاتنەماڵەوە تا بزانێ ژنەکـەی چی ئەکاو بەبێ هۆ تاوان بار کردنی ئافرەتی قەدەغە کردووە )[1] هەروەها لە نمونەیەکی جوانی ڕەفتار لەگەڵ هاوسەر دا (عائشە) ڕەزای خوای لێ بێ ئەڵێت :ـ [ تازە هاتبووم بـۆ لای پێغەمبـەر ] یاریم بە بوو کە شووشەیەك ئەکـرد کـە پێغەمبەر منی دی هـات لەگەڵما یاری بەبووکە شووشە ئەکرد ][2] ئەمە لەو کاتـە بوو کـە گاورەکان بووکە شووشەیان ئەپەرست .

کاتێ کە بیر لە ژن هێنان ئەکەیتەوە ئەم شتانەت دێتە پێش :ـ

## داخوازی کردن ( الخطبة )

ئیسلامی پـیرۆز بڕیاری داوە کەوا دوو دڵخوازەکـە یەکتر ببینن زۆر بە جوانی تاکو کاتێ لە یەکتر مارەکران هەردوکیان لە یەکتر ڕازی بن لـە دوا ڕۆژا خـۆشی‌و ناخۆشی لەملی خۆیان بێ .. جارێکیان ( موغەیرەی کوری شوعبە ) کچێکی داخـوازی

(١) موسلیم ئەگێرتەوە .

(٢) ئیتفاق کراوە لەسەر (متفق علیه) .

کرد پێغەمبەری مەزن پێی فەرموو : ( سەیری بکە باشترە کە هەردوکتان لە یەکتر ڕازی بن )[1] ئەوەی ئاشکرایە ئیسلام ڕێ نادات زیاتر لە دەم‌و چاوو لەپی دەستی زیاتر ئافرەت سەیر بکرێت تەنها لەکاتی داخوازی کردن نەبێت کە ئەبێ ئەو کاتە بەباش یەکتر ببینن : ( ئەگەر یەکێ ویستی کچێك بخوازێ با سەیری بکات بە جوانی هیچ گوناهێکی نی‌یە )[1] بەلام بەداخەوە لەم سەردەمە ئەبینین کە پێش مارە بڕین بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەل یەکترا ڕائەبوێرن ••• ئەمە لەڕێرەوی مرۆڤایەتی‌و ئیسلامەتی دوورە •• زۆرجار ئەم تێکەڵ بوونە تاوانی لێ ڕوو ئەداو پیاوەکە بۆی دەرئەچێ بەلام بۆی هەیە ئافرەتەکە لەگەڵ دڵخوازەکەی بەجل‌و بەرگێکی شەرعی بچنە دەرەوە بە مەرجێ یەکێکی نزیکی کچەکە لەگەڵیان بێ گەر مارەیان نەبڕا بوو ئەمەش بۆ چوونە دەرەوەی پێویست ••• ئیسلام لەڕوانگەیەکی پاکەوە سەیری ئەم مەسەلەیە ئەکات نەك وەکو ڕۆژ ئاواییەکان کە کچەو کورەکە ماوەیەك لە باوەش یەکتربن و دواییان بۆ یەکتر ئەبن یان نا ••• دیسانەوە نەك وەکو ڕۆژ هەلاتیەکان کە بەهیچ جۆرێ ماوەنادەن کوڕەکە کچەکە ببینێ بەڵکو ئافرەتەکە شوو ئەکات نازانێ بۆکێ‌یە یەکتریان نەدی‌وەو بەبریاری کەس‌و کاری

(۱) بوخاری و موسلیم ئەگێرنەوە •

(۲) هەر پێنجیان ئەگێرنەوە تەنها ابو داود نەبێ •

شووی کردووه ••• ئەگەر کچێ داخوازی کرا نابێ یەکێکی تر دیسان بچێ داخوازی بکات تا ئەوی یەکەم وازی لێ نەهێنێ چونکە ئەبێتە هۆی بەر بەرەکانی وەکو پێغەمبەر ئەفەرموێ : [ لایخطب الرجل علی خطبه الرجل حتی یترك الخاطب قبله او یأذن له ][1] • وەزاناکانی (مالك)ی دەڵێن [ گەر کەسی دووەم لە سەر داخوازی یەکەم مارەی کرد مارەیی‌یەکەی بەتاڵە ] بەڵێ ئەمەیە نیشانەی گیانی رەوشتی ئیسلامی مەزن •

## مارەیی

ئاسان کردنی ژن هێنان بە سووك کردنی ئەو بارەی کەس و کاری کچەکە ئەی خەنە سەر ژن هێنەر •• هەموو یاساکانی ئیسلام لە سەر سوك کردن و ئاسان کردنی هەموو لایەکانی ژیان دامەزراوە ••• هاوسەری مۆرێکی ئەزەلی‌یە ، خوای گەورە خستۆیەتی‌یە چوار چێوەی یاسایەکی بەرز و روون بۆ گەشە کردنی ئادەمیزاد لەم ئەستێرەیە ••• گران کردن و کۆسپ ئەگەرە خستنە سەر رێگای ژن هێنان و شوو کردن بە تاوا نێکی گرنگ ئەزمێررێ لە پەیرەوی ئیسلام دا وەکو خوای گەورە ئەفەرموێ [ ماجعل علیکم فی الدین من حرج ] وە پێغەمبەری مەزن

(١) ئەحمەد وبوخاری ونسائی ئەگێرنەوە •

ژن هێنانی ( بارسوکی ) به مەزن ترین هاوسەری داناوه [ ان اعظم الزواج برکة أیسره مئونه ][1] وه دیسان ئەفەرموێ ( خیر الصداق ایسره )[2] .. لەگەل ئەوەش خوای گەوره سنووری بۆ زۆری و کەمی مارەیی دانەناوه چونکه هەر چەند مارەیی زۆر بدەنێ حەلاڵی خۆیەتی وەك پێغەمبەر ئەفەرموێ : [ لو ان رجلا اعطی امرأة صداقا ملء یدیه طعاما کانت حلالا له ][3] ... هەروەها عومەر ئەڵێ : ( له بەخشینی صداق )ی ئافرەت زیاد مەکەن ئەگەر بۆ دونیا و دوا رۆژتان باشی بوایه پێغەمبەری مەزن پێش هەمووتان زیادی ئەکرد ][4] مارەیی کەمی و زۆریەکەی به پێی هەبوون و نەبوونی ژن هێنەره گەر زۆری هەبوو چەند بدات حەلاله بەلام نابێ گەر ژن هێنەر نەی بوو زۆری لێ بکری بۆ زیاد کردنی .

## « مارەیی مافێکی حەلاڵی ئافرەته »

مارەیی شتێکه لەو شتانەی ئیسلام به ئافرەتی بەخشیووه وەکو خوای گەوره دەفەرمووێ [ وآتوا النساء صدقاتهن نحلة ][5]

(١) ئەحمد و بوخاری و نسائی ئەگێڕنەوه .

(٢) ئەحمەد ئەگێڕتەوه .

(٣) ئەحمەد و ئەبو داود ئەگێڕنەوه .

(٤) ئەبو داود و ابن ماجه و نسائی و ترمذی ئەگێڕنەوه .

(٥) النساء : ئایەتی : ٤

(صدقات) کۆی (صدقة) یە بەمانای مارەیی دێت هەروەها مانای ئایەتەکە ئەوەیە کەوا [ ئەو مارەیی یەی بەخشراوە بە ئافرەت پێویستە پێی بدرێت ] هەروەکو ئیمامی قورتوبی ئەڵێ ( مارەیی بەخشینێکە لەلایەن خواوە بۆ ئافرەت )[1] .

لەپێش هاتنی ئیسلام مارەیی ئافرەت ئەدرا بەکەس‌و کارەکەی‌و ئافرەت هیچ سودێکی لێ نەئەبینێ هەرکاتێ ئیسلامی پیرۆز هات‌و دەسەڵاتی ئیسلامی چەسپاند .. مارەیی کرد بەمافێکی تەواوی ئافرەت‌و فەرمانی‌دا کە کەس بۆی نی‌یە داوای لێ بکات‌و ئافرەت چۆنی بوێ وا بۆ خۆی دائەنێت سوودی لێ دەبینێت نە باوکی نەکەسێ تر نەمێردی ناتوانن بەبێ خۆشی خۆی داوای لێ بکەن ئەوەی شایانی باسە تائێستا ئافرەتی ڕۆژ ئاوا ئەو پلەیەی وەرنەگرتووەو ئەو سوودەی نەبینیوە ، لەڕۆژ ئاوا پێویستە لەسەر ئەو باوکەی کچ بەشوو ئەدا مارەیی ( دۆتە ) یەك دابنێت بۆ ئەو کەسەی کچە کە دەهێنێ ، پاش هێنانی کچەکە ئەو مارەیی (دۆتە)یە دەبێتە مافێکی تەواوی مێردەکەی‌و ئافرەتەکە هیچی بۆنی‌یە .. ئەم یاسایەش دەگەڕێتەوە بۆ یاسا کۆنەکانی سەردەمی ڕۆمەکان‌و ئەغریقیەکان .

---

(۱) ل ۲٤ جـ٥ تەفسیری قرطبی

## « جیاز ـ تجهیز المرأة ـ »

وەکو لە پێشدا گوتمان مارەیی مافێکی تەواوی ئافرەتە تابۆی نی‌یە کەلو پەلی ناو مالیش پێ‌بکرێت ئەگەر بەدلخۆشی خۆی نەبێ ( وآتوا النساء صدقاتهن نحلة فأن طبن لكم عن شيىء منه نفسا فكلوه هنيئا مريئا )[1] هەندێ لە پیاوان کەس‌و کاری ژنەکەیان تەنگاو دەکەن‌و داوای کەل‌وپەلی گران بەهایان لێ‌دەکەن هەروەها بەپێچەوانەی هەندێ ئافرەت ئەو داوایە لەمێردەکانیان دەکەن لەو سەردەمە ، ئەوە هەروەکو مالی یەکێ بەناهەق بخۆیت وایە زۆر جاری وا هەیە کەس و کارِی ئافرەتەکە مارەیی یەکەی هەمووی خەرج دەکەنەوە و زیاتریش لەسەردا دەنێن •• ئەوە لەلای ئیمەش بۆتە باو کە ئافرەت لە مارەیی‌یەکەی خۆی خەرج دەکات بۆ کرینی کەل‌وپەلی ناومال بەویستی خۆی بەلام پێویستە کەل‌وپەلی بێ کەلك نەکرێت‌و بەشتی پێ‌ویست خۆی خەریك بکات ( ان المبذرين كانوا اخوان الشياطين ، وكان الشيطان لربه كفورا ) •

## « زەماوەند »

أ ـ چێشت درووست‌کردنی لە ئاهەنگی زەماوەندا :ـ

لە ئاهەنگی ژن گواستنەوەو زەماوەند زۆری هاورێ‌و دۆستانی بوك وزاوا بەشداری تیادەکەن‌و بەو بۆنەیەوە

(١) النساء : ٤١

ئاهەنگــی تیا دەگێــرن ئــەو ئاهەنگەشــی پێویســتی بەخواردنو چێشتێکــی زۆر هەیە ... زۆر زۆریش ناکــە پاش ماوەکە بە فیڕو بچێت .

عــەلی ( ڕەزای خــوای لێبێت ) کە فاتیمــە ی گــواستەوە پێغەمبەر داوای کرد کە ( دەبێ چێشت لێ بنێن )[1] بۆیە هەندی لەزاناکان چێشت لێ نان لە بووك گواستنەوە بەپێویست دەزانن .. کاتێك کە پێغەمبەر (د.خ) ( زەینەب کچی جحش )ی گــواستەوە مەڕێکی سەر بڕی‌و کــردی بەچێشت کــە (صفیە)ی گــواستەوە داوەتی بە خورماو هەنــدێ ووردە شتی تر کــردو جارێکیان بــە ( عەبدول رەحمان کوری عەوف )ی ووت داوەت بکە گــەر بــە مەڕێکیش بێت ) جا زاناکان داوەتیان ( بەپێ توانای زاوا داناوە )[2] بەلاَم ئەو کەسەی توانای زۆری هەیە ( نابێ لە مەڕێك کەمتر بکا بە چێشت )[3] ..

پێویستــە لەســەر داوەتکــەرەکە هــەموو دۆستەکــانی داوەت بکا چ دەولەمەند بن چ هەژار نابێ جیاوازی بکات وەکو پێغەمبەری مەزن دەفەرمووێ : [ شر الطعام الولیمة ، تدعی الیها الاغنیاء وتترك الفقراء ][3] ئــەوەی بانگ بکــرێتە ســەر داوەت دەبێ بچێ وەکــو

(١) ئەحمەد دەگێرێتەوە .

(٢) : (٣) نیل الاوطار

(٣) بخاری ومسلم دەگێڕنەوە .

پێغەمبەر دەفەرمووێ : [ واذا دعي احدكم الى الوليمة عرس فليجب ][2] .. بەڵام ئەگەر لەداوەتەکە خواردنەوەی شەڕابو مەی تیا بوو یا بەزمێك کە لەئیسلامدا • قەدەغەیە نابێ بچێت وەکو پێغەمبەر دەفەرمووێ : [ من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يقعد على مائدة يدار عليها الخمر ][3] •

ب ـ سەماو گۆرانی لە ئاهەنگی بووك گواستنەوەدا :ـ پێغەمبەری مەزن ڕێی داوە بەهەڵپەرکێو گۆرانی ووتنو دەفلێدان بەمەرجێ کەپیاو ژن تێکەڵاو نەبن .. بەڵام دەگونجێ کەوا شایی ئافرەت لەلایەك بێتو هی پیاوان لەلایەك کە چاوپڕ کێی تیا نەبێ .. دەگێڕنەوە عائشە کچێکی نزیکیخۆی بۆ پیاوێك لە پیاوانی(الانصار) گواستەوە پێغەمبەر فەرمووی[ئەی عائشەهیچ بەزمێك تان ڕێك نەخستوە لایەنگیر ( انصار )ەکان حەز بە ئاهەنگ گێڕان دەکەن ][1] .. ئەم بەزمەش بریتیە لە گۆرانی ووتنو لێدانی دەفە ، پێغەمبەر ئەفەرمووتی [ فصل مابين الحلال والحرام الدف والصوت في الزواج )[2] •

---

(2) موسلم وئەبو داود دەگێڕنەوە

(3) رواه الخمسة الا ابو داود

(1) ئەحمەد وبخاری دەگێڕنەوە •

(2) رواه الخمسة الا ابو داود •

پێغەمبەر بووك گواستنەوەی بێ ئاهەنگی قەدەغە کردووە وەکو ( عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەد ) لەمەسنەدا دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ( كان يكره نكاح السر ، حتى يضرب بدف ويقال : اتيناكم .. اتيناكم .. فحيونا نحيكم ) بەڵام نابێ لەبەزمی بووك گواستنەوەدا گۆرانی پڕو پوچو بێشەرمانەی تیا بووترێ وەکو وەسفو پیاهەڵدانو هەڵگوتنی بەژنو باڵای ئافرەتو ئەندامەکانی لەش ئەگەر گۆرانی بێژەکە ئافرەتیش بوو قەی ناکا وەکو دەگێڕنەوە : کاتێ (عائشه) خزمێکی بۆ لایەنگیر ( انصار ) یێك گواستنەوە پێغەمبەر فەرمووی : [ ئایا هیچ کەسێکتان لە گەڵیا ناردووە گۆرانی بڵێت ] عائشه ووتی : نەخێر پێغەمبەر فەرمووی : [ ئەنصار حەز بە گۆرانی دەکەن ئافرەتێك لەگەڵیا بنێرن دەف لێبداتو گۆرانی بلێ .. عائشه ووتی لە گۆرانیەکەدا چی بڵێت .. پێغەمبەر فەرمووی :ـ

[ هاتین هاتینه لاتان بەخێرمان بێنن بەخێرتان دەهێنین گەر لەبەر ئەودانە ڕەشە نەبوایە لەو شێوەی ئێوە هەڵمان نەئەدا ] .

[ اتيناكم اتيناكم فحيونا نحييكم
ولولا الحبة السمراء لم نحل بواديكم ][1]

---

(١) ئەحمەد و بوخاری وابن ماجە دەگێڕنەوە .

## « سەرپۆشی ـ الحجاب ـ »

سەر پۆشی لە کۆمەڵگای ئیسلامدا تائێستا بە مانایەکی ترسناكو هەڵە لێك دەدرێتەوە .. زۆر کەس وا تێ دەگەن کەوا پۆشینی ئافرەت بە دەر نەکەوتنی و لەناو چوار دیواری مالا دەبێت و گەڕانی بۆ هەموو لایەکی لێ قەدەغە بکرێت .. لە زۆر جێگا وا باوە کە ئافرەت نابێ بڕواتە ماڵی باوکیش تا دەمرێت .. دەبێ لە دەرکەوتنی قەدەغە بکرێت .. لەو کاتەی کە لە ماڵەوە دا دەنیشێت نابێ هیچ بێگانەیەك ببینێ و کەسیش ئەو نەبینێ بە جۆری کەوا گەر ئافرەتەکە لە پارێکی نەساغی دابوو و زۆر نەخۆش بوو نە دەبوو پزیشك ببینێ چونکە پزیشك بێگانە بوو ... لە هەندێ جێگای تر گەر شەو نەبوایە نەیان دەهێشت ئافرەت لە ماڵ بچێتە دەرەوە بۆ سەردانی کەس و کاری .



## « سەرپۆشی خێزانەکانی پێغەمبەر د.خ »

لە قورئانی پیرۆز دا بەرامبەر بەسەر پۆشی ئایەتێك هەیە کە دەربارەی ژنەکانی پێغەمبەر هاتۆتە خوارەوە و زانایان جوانیان لێك داوەتەوە :ـ [ یا ایها الذین آمنوا لاتدخلوا بیوت النبی الا ان یؤذن لکم الی طعام غیر ناظرین اناه ، ولکن اذا دعیتم فادخلوا فاذا طعمتم ، فأنتشروا ولا مستأنسین لحدیث ، ان ذلکم کان یؤذي النبی فیستحی

منكم والله لايستحي من الحق واذا سألتموهن متاعا فأسألوهن من وراء حجاب ذلكم اطهر لقلوبكم وقلوبهن ][1] جا با بزانین ئەم ئایەتە پیرۆزە لە چ کاتێکدا هاتۆتە خوارەوە ••• عومەری کوڕی خەتاب بەهۆی بیر تیژی‌و هەستی خودی خۆی هەستی بەوە کرد کەوا خێزانەکانی پێغەمبەر لە بارێکی تایبەتی دان جیاوازیان هەیە لەگەل ژنانی تر جا ئەبێ ڕوو پۆش بەکار بهێنن ئەو داوایەشی لە پێغەمبەر کرد •• بەلام پێغەمبەر هیچ دەنگی نەکردو وەلامی نەدایەوە •• چونکە پێغەمبەر لە خۆیەوە نەیتوانی‌وە هیچ بڕیارێك بدات بۆیە چاوە ڕوانی ئەمینی پەیامی کرد لە لایەن خواوە بێت ئەوسا ئەم ئایەتەی سەرەوەی بۆ هاتە خوارەوە کە بە ئایەتی سەرپۆشی بەناوبانگە هەروەکو ( موسلیم و بوخاری ) دەگێڕنەوە کەوا عومەر بە پێغەمبەری گوت : ئەی پێغەمبەری خوا کەسانی چاك و خراپ دێتە مالەکەی تۆ ، باشترە داوا لە دایکانی موسولمانان بکرێت کە خۆیان بپۆشن جا لەکاتی گواستنەوەی ( زەینەب کچی جەحش ) بۆ پێغەمبەر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە •

عومەر ( خ • ز ) بڕیاری وا بوو کە کەس خێزانەکانی نەبینێ و لەمال نەچنە دەرەوە تا کەس ذاتی ئەوان نەناسێ ئەگەر ڕوو پۆشیش بن •• دەگێڕنەوە جارێك ( سۆدەی کچی زومعە )ی خێزانی پێغەمبەر کاتی شێوان لە مالەوە بۆ کارێکی پێویست هاتە

(١) ئەلئە حزاب : ٥٣

دەرەوە و هەموو لەشی پۆشرا بوو لە سەریەوە تا قاچێ پێیەکانی بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا (عومەر) ئەوی ناسی چونکە ئافرەتێکی زۆر کەڵەگەت و باڵا بەرز بوو عومەر پێی گوت : ( ئەی سۆدە بەخوا لە ئێمە ناشار درێیتەوە چۆن دێیتە دەرەوە و چی دەکەی پێتەوە دیارە ) کاتێ (سۆدە) گەڕایەوە لای پێغەمبەر کە لە ماڵی عائشە بوو قسەی عومەری بۆ گێڕایەوە •• پێغەمبەر ئەو کاتە نانی شێوانی دەخوارد پەیامی بۆ هاتە خوارەوە سەری بڵند کردو فەرمووی : ( ماوەتان درا بۆ پێویستیەکانتان بچنەدەرەوە ][1] ڕوو پۆشی لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەر پێویست بووە تا نابێ دەم و چاوو ناو لەپی دەستشیان دیار بوو بێت هەروەکو ( قازی عەیاز ) دەڵێ ( ئەو سەر پۆشی‌یە پێویست بووە لەسەر ژنانی پێغەمبەر وەك پۆشینی دەم و چاوو تا پەنجەکانیش لە شایەت دانیش نە دەبوو دەری‌خەن )[2] بەم جۆرە زۆر لە ئافرەتە بەڕێز و موسوڵمانەکان ئەم جۆرە پۆشینەیان بۆ خۆیان تەرخان کرد •• تا ڕۆژ دوایی ڕوز وای لێ هات لە ئادابی ئیسلام چوونە دەرەوە تا نەیان دەهێشت بۆ خوازبێنیش کەس کچەکانیان ببێنێ •

---

(١) بوخاری دەگێرتەوە ( چیرۆکەکە لەگەڵ فەرموودەکانی لە تەفسیری قرطبی‌و ابن الکثیر و طبری هاتوون ) •

(٢) کتابی ( حجاب المرأة المسلمة )ی شیخ محمد ناصرالدین البانی •

ڕاستی سەر پۆشی ئافرەتی موسولمان ڕستەیەکە لە ئاداب و ڕێبازی ئیسلام بۆ پوچەڵ کردنەوەی هەموو وێنەیەك لەو وێنانەی ڕووت بوونەوەو بەرەڵلایی و دەرخستنی هەموو وێنەیەك کە دەبێتە هۆی بزواندنی شەهوەتی ئادەمیزاد کەم کردنەوەی بەرزی پەیوەندی ڕاستەقینەی ئافرەت و پیاو دانانی ڕێباز و سنوورێکی پاكو بێ گەرد لە نێوان ئەو پەیوەندە •

بۆ دەر خستنی ئەم شوێنە پیرۆزەی کە ئیسلام بە ئافرەتی داوە دەبێ ئەوە بزانین کەوا ئافرەت لە سەر دەمی پێش ئیسلام تەنها بۆ شتێك و کارێك خۆشەویست بوو ئەمەش تەنها کاری (سێکس) بوو چێژ وەرگرتن کە خوشەویستیەك و پەیوەندیەکی یەك‌جرکەیی دەخایاندو بەس •

زۆر لەو کەسانەی کە دڵیان ڕەشە داوای ڕووت بوونەوەی ئافرەت دەکەن بە ناوی سەر بەستی و بەرەڵلا بوون تاکو ئافرەت بە سووکی و ئاسانی دەست گیر بکەن ••• ئەوسا خوای گەورە بۆ پاراستنی ئافرەت لەم ( نەخۆشانە ) یا دڵ ڕەشانە داوای لە ئافرەت کردووە کەوا سنوورێکی تایبەت لە ڕەفتارو پۆشین دابنێت و ئەم پۆشینەی ئافرەت دەگێڕێتەوە بۆ چەند ڕواڵەتێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی :-

یەکەم :ـ دەبینین کەوا چۆن داوا لە ئافرەت کـراوە بیکات واش داوا لە پیاو کراوە بەرامبەر ئەوە لە ئاست بزوێنەری شەهەوەت چاو بپۆشێ ( وقل للمؤمنات یغضضن من ابصارهـن ویحفظـن فروجهن )[1] دەبینین لەپێش ئەم ئایەتە خوای گەورە دەفەرموێ :ـ [ قل للمؤمنین یغضوا من ابصارهم ویحفظوا فروجهم )[1] •

دووەم : ئەو خوو و ڕەوشتە بریتیە لە خوو ڕەوشتێکی پتەو و قوڵ و ڕەسەنو داوای چاك بوون و پاك کـردنەوەی دەروون و ناوەوەی ئادمیزاد دەکات نەوەك هەر دیوی دەرەوەی •• هەروەها بۆ هێمن کردنەوەی دەریای شەهـوەتی ئادەمیزاد ئـەم خـوو و ڕەوشتەی دەرخستووە و ئەو پەردەیەی لە نێوان ئافـرەت و پیـاو دانـاوە چـونکە ئادەمیزاد لـەو ووزە سکسیەی کـە لـە لەشیا هەڵتەگیرسێ لەگەڵ یەکەم دەرکەوتنی کەرتەکەی تری گەر ئـەم ووزەیە بەتاڵ نەکرێتەوە لە ڕێگاو جێگای ڕاستی خۆی ئەوە دەبێ تاوانێك بکات بۆ بەتاڵ کردنەوەی جا ئەم ئایەتە پیرۆزە لە جێگای خۆیەتی بۆ پاکی دڵ و دەروون ( واذا سألتموهن متاعا فأسألوهـن من وراء حجاب ، ذلکم أطهر لقلوبکم وقلوبهن ) •

سێیەم :ـ هەروەها لە ڕواڵەتی ئەم خوو و ڕەوشتە ڕاگرتنی دەرەوەی دەروونی ئادەمیزاد بە جۆرێ کەوا لەگەڵ ناوەوەی دڵ و

---

(١) ئەلنور : ٣٠ ـ ٣١

دەروونی بلوێت لە پیرۆزی و بەرزی‌و ڕەوشت پاکـی ئەوەش بـە نەفرەت کردنی ئەم جل و بەرگەی کەوا لەشی ئافـرەت دەکـاتە پێشەنگایەك بۆ چاو برسیانی لەش و ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیەو دوور کەوتنەوە لەو کەرەستانەی کەوا ئەندامەکانی لەشی ئافرەت بەرەللا دەکات لە سەردەمی نەزانی پێش ئیسلام هەندێ کەس شەوان لە کۆلان گەر ئافرەتێکی جوانیان دیبایە و ڕووی جـوانی بە دەرەوە بوایە دەیـان زانی جـوانە و بۆ بەدکـاری پەلاماریان دەدا •• بۆیە پێغەمبەری خوا داوای لە خێزانەکـانی خۆی کـرد بەپێی فەرموودەی خوا کەوا خۆیان بپۆشن :ـ [ یا ایها النبی قـل لازواجك ، وبناتك ونساء المؤمنین یدنین علیهن من جلابیبهن ، ذلك ادنی ان یعرفن فلا یؤذین ][1] •• هـەروەها دەفەرمووێ :ـ [ لئن لم ینته المنافقون والذین فی قلوبهم مرض ، والمرجفـون فی المدینة لنغرینك بهم ثم‌لایجاورونك فیها الا قلیلا ملعونین اینما ثقفوا ، اخذوا وقتلوا تقتیلا ][2] •

چوارەم :ـ ئەو یاسایەی نێرو مێ دەگرێتە خۆی یاسای ژیانی هەر دوکیانە ، پیاوەکە لە چوار چێوەی سروشتی پیاوەتی خـۆی دەژیت کە بۆی‌دانراوە ، بە هیچ‌جۆرێ نابێ پیاو یاری بەو کارو•• هەست و نەستە خۆڕسکەی خۆی بکات و لە ڕێگای تایبـەتی خۆی

(١) ، (٢) : الاحزاب : ٥٩ ـ ٦٠ ـ ٦١

لابدات و به شوێن شێوازو ڕەنگ و دەنگی ئافرەت بکەوێت •••
هەروەها ئافرەتیش نابێ لە کارو شێوەی ڕاستەقینەی خۆی لابدات
( کوڕی عەباس ) دەڵێ :ـ ( پێغەمبەری خوا نەعلەت لەو پیاوە
دەکات کە وەکو ئافرەت ڕەنگ و ڕوخساری هەڵدەگرێت و نەعلەت
لەو ئافرەتەش دەکات کە خۆی وەك پیاو لێ دەکات بە ڕەنگ و
ڕوخسار ][1] هەروەها ئەبوهورەیرە دەڵێ :ـ [ پێغەمبەر نەعلەت
لەو ژن و پیاوە دەکات کە جل و بەرگی یەکتر دەکەنەبەر ][2] •
وەك ئێستا چۆن بە جارێك ئافرەت و پیاو جل و بەرگی
یەکتریان گۆڕیوەتەوە یا یەك جل و بەرگ دەبەر دەکەن هەتا
چۆنیەتی قژ داهێنانیشیان وەکو یەکە لە ڕێڕەوی ئیسلامدا نێرینە و
مێینە دەسکاریەکی خواییە ( ومن كل شيء خلقنا زوجين ، لعلكم
تذكرون ][3] ئایا بۆچی خوای گەورە بۆ هەموو شتێك نێرێك و
مێیەکی دروست کردووە ••• خۆچواندن ( تشبه )ی ئافرەت بە
پیاو و پیاو بە ئافرەت تەنها لە ڕێ لادان و لە ڕەوشت لادان نییە
بەلکو یاری و گاڵتە کردنە بە یاساکانی گەردوون و دەسکردەکانی

(١) ابو داود و بخاري و ترمذي و نسائي و ابن ماجه و طبراني دەگێڕنەوە •

(٢) ابو داود و نسائي و ابن ماجه ، دەگێڕنەوە •

(٣) الذاريات : ٤٩

خوای مەزن ئادەمیزاد (سوننەت) ێکی مەزنە بەلکو پیرۆزترین سوننەتی سروشتە •• ئەوەی یاری بەیاساکانی ئەم گەردوونە بکات دەروون بۆشە و بیر بلاوە ، لەم گەردوونە بەبێ ڕوانگە دەخوێنتەوە • • ئیسلامی پیرۆز ڕێگەی چاك و ڕەوشت پاکی دەست نیشان دەکات بۆ ئادەمیزاد بە پیاو و ژنەوە ••• تاوانی گەورەی خواچواندنی ئافرەت بە پیاو لەوە دایە کەوا ئەم کارە ترسناکە دەبێتە هۆی تێك دانی کارزانی و پسپۆری هەر یەکێکیان لە گۆڕەپانی پسپۆرایەتی خۆی •

پێنجەم : سروشت پسپۆرانە هەڵساوە بە ئامادە کردنی ئافرەت •• ئامادە کردنێکی دروستی تایبەت بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری ناومال و مالداری ، خۆ گێل کردن و لاملێ لەم کارە تایبەتە ترسناك ترین کارە دژی ویستەکانی خۆرسك •

کاتێ خوای گەورە دەفەرموێ ( قرن فی بیوتکن ) بە مانای جێ گیربوون ئارام گرتنە لە مالەوە ـ کە جوانترین شێوەی ئامادە بوونی ئافرەتە بۆ ئەنجام دانی کاری تایبەتی خۆی لە ناومال و منالەکەی خۆی دا لەو کاتەش دا بۆ پێویستیەکان دەبێ بچنە دەرەوە وەکو پێغەمبەر دەفەرموێ :ـ ( انه قد اذن لكن ان تخرجن لحاجتكن ) یانی خوای گەورە ماوەتانی دا کە بۆ پێویستیەکانتان بچنە دەرەوە •

« بەلام ئافرەتی موسولمان دەبێ پەیڕەوی ئەم دووشتە بکات » •

أ ـ نابێ بە هیچ جۆرێ بە تەنها لەگەل کەسێکی بێگانە کۆببێتەوە بەبێ ئەوەی کەسیکی نزیکی ئافرەتەکە لەلایان بێ •

ب ـ دەبێ ئافرەتەکە هەموو لەشی پۆشراو بێ جل و بەرگێکی موسولمانانەی لە بەرابێت نابێ بە جوانی دەستکرد خۆی نیشانی بێگانە بدات وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : (ولا يبدين زينتهن الا ماظهر منها )[1] قورتوبی ( قرطبی ) لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە دەڵێ :ـ دوو جۆرە جوانی هەیە جوانی دیارو جوانی نادیار ، جوانی دیار وەك بازنو ئەموستیلە و کل •• ئەمانە دەریشی خات دەتوانێ ، بەڵام جوانی نادیار وەك گەردانەو پێوانە و گوارەو تامە و شتی تر نابێ دەریان خات بۆ کەسی بێگانە وەکو خوای گەورە دەفەرموێت [ولايبدين زينتهن[2] الا لبعولتهن او آبائهن او آباء بعولتهن او ابنائهن او ابناء بعولتهن او اخوانهن او بني اخوانهن او بني اخواتهن او نسائهن او ما ملكت ايمانهن او التابعين غير اولي الاربة من الرجال او الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء ][3] •

## ( جوانی ئافرەت )

أ ـ ڕووو جوان کردن •••

ڕێبازی ئیسلام ماوەی ئافرەتی داوە چۆنی دەوێ بەو جۆرە خۆی بۆ مێردەکەی جوان بکات و خۆی بۆ بڕازێنێتەوە ، بەڵام لە

---

(١) النور ، ٣١

(٢) جوانی نادیار

(٣) النور : ٣١

ڕاستیدا ئادەمیزادێتی ئافرەت ڕاستی جوانیەکەیەتی جا بۆ ئەوەی ■ بلێی جوان و شیرین بێت دەبێ پلەی ئادەمیزادێتی بەرزبێتەوەو لـە ڕادەی ئاژەلی دەرچێت ..

ئەقل و گرانیو بەرزی و ڕۆشنبیرێتی ئافرەت لەگەل کـردارە جوانەکانی بەرز ترین نیشانەی جوانیەکەیەتی ... دەگێڕنەوە ( ام البنین ) خوشکی خەلیفە عومەر کوڕی عـەبدول عـەزیز دەلێت [ چ پۆشینێك و گەردانەیەك جوانتر نی‌یە لە گەورەیی و بەرزی خـوای گەورە لە دلدا ... چاوم بە دوای هیچ شتێك نەبووە تەنها بە کرداری باشەوە نەبێ کە حەزم کردووە منیش بەشداری ئەم چاکەیە بم ][1].
ئەم شاژنە یەکـێ بوو لە هـەرە خانمـە دەولەمەنـدەکانی کـۆشکی خەلیفەکانی ئەمەوی لەگەل ئەمەش دا لە گەورەیی و بەرزی خـوای گەورە بەلای ئەوەوە هیچ شتێکی‌تر جوان و ڕێك تر نەبووە [ ولکن الله حبب الیکم الایمان وزینه فی قلوبکم ][2] .

ب ـ جوانی جل و بەرگی ئافرەت .

لە ڕێبازی ئیسلام ئافرەت بەپێی هەبوونی و دارایی دەتوانـێ جل دەبەر بکات ئەگەر حەریریش بێت بەلام نابـێ بەدوای جـل و

---

(١) لە لاپەڕە ٢٧١ ی ج٤ ی کتێبی (الصفوة)ی ابی فرج ابن جوزی وەرگیراوە .

(٢) سورەتی الحجرات : ٧

بەرگی گران خۆی تووشی قەرزاری بکات ، ئیسلام ڕێ نادات هەر بۆ ناوبانگی جل و بەرگ بکڕێت و ( مۆدێلات ) بگۆڕی ٠٠٠ دەبێ بەپێی یاسای ئیسلامەتی جل و بەرگی موسولمانە دەبەر بکات و هیچ جێگایەکی دیار نەبێت ٠

ج - زێــڕ و زیو :-

ئافرەت دەتوانێ بەپێی هەبوونی زێڕ و زیو دەبەر بکات هەر وەکــو عائشە ( ڕ٠خ) دەڵێ:- [ نەجاشی ئەموستیلەیەکی زێڕی بە دیاری دا بە پێغەمبەر و ئەویش چەند جارێــك ئـاڵ و گۆڕی کــردو بانگــی ( ئیمامەی کچی زەینەب ) ی کچی کردو وفەرمووی : ها کچۆڵە ئەمە بکە پەنجەت ][1] ٠٠٠ ئافرەت جگە لە زێڕ بۆی هەیە زیو و یاقووت و مەرجان و ئەلماس بکاتە بەری (خلق لکم مافی الارض جميعا) دیسانەوە خوای گەورە دەفەرموێ : ( ومن كل تأكلون لحما طريا وتستخرجون حلية تلبسونها )[2] ٠

د - بۆن و بەرام ٠

ئافرەت بۆی هــەیە خۆی بۆن خۆش بکات بە هــەر چ بون و بەرامێك بە تایبەتی کاتێ لەگەڵ مێردەکەیا دەبێت ٠٠٠ بەڵام وا باشە لە کاتی دیار نەبوونی مێردەکــەی واز لــە بۆن و بەرام بهێنــێ وەك

(١) ئەحمەد و ئەبو داود دەگێڕنەوە ٠

(٢) سورەتی فاطر : ١٢

دەگێڕنەوە ( خێزانی عوسمان کوڕی مظعون خۆی بۆن خۆش دەکرد ، جارێکیان هاتە لای عائشة و خۆی بۆن خۆش نەکرد بوو ، عائشە گوتی : خێرە خۆت بۆن خۆش نەکردووە ؟ ئەمیش لە وەڵامـا گوتی : عوسمان حەز بە دونیا ناکات و خۆی لێم دوور دەکاتەوە .
عائشە ئەمەی بۆ پێغەمبـەر گێڕایەوە ... پێغەمبـەریش ڕۆژێك بـە عوسمانی گوت : [ ئایا تۆ باوەڕ بەوە دەکەی کە ئێمە باوەڕمان پێی هەیە ؟ لە وەڵاما گوتی : بەڵێ .. ئەوسا پێغەمبەر فەرمووی : ( تۆش لەگەڵ خێزانەکەت وەکو ئێمەبە ][1] .

هـ ـ نەشتەرگەری بۆ جوان کـردن ـ عمليـات التجميـل ـ
نەشتەرگەری جوان کردن دوو جۆرن :ـ

یەکەم ـ خۆ جوان کردن بە ڕاست و چەپ کردنی ددانەکان و برین سازی بە گۆڕین و کورت و گەورە کردنی ئەندامەکانی لەش و گۆڕینی ئەم ئەندامانەی خوای گەورە پێی داوی .

دووەم ـ خۆ جوان کردن بە کل و بۆیە و خەنە ..

ڕاست و چەپ کردنی ددانەکان و کورت کردنەوەیان یا ئەوەی پێی دەڵێن خۆ جوان کردن بە برین سازی ( التجميل بالجراحة ) لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە قەدەغەی کردووە ... ڕێبازی ئیسلام ئافرەت

(1) ئەحمەد دەگێڕێتەوە .

لە خۆ جوان کردن قەدەغە ناکات هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد بەڵام خۆ خەریك کردن بە جوانی کردنی دەرەوەی ئادمیزاد و کەم تەرخەمی کردن لە پاك کردنەوە و ڕوونکردنەوەی بەشی ناوەوەی دەروونی ئادەمیزاد بــە هەنگاوێکی کوێــرانە دەژمێررێ ، ئادەمیزاد دڵ و دەروونی پاك و بێ گەرد بێ و بە تیشکی ڕۆناکی خوای مەزن پرشنگ دار بێت هەموو ئەندامەکانی تری دەرەوەی جوان دەکات ٠ زۆر لە ئێمە دیومانە ئادەمیزادێك لەگەڵ ئەوەی زۆریش ناشیرینــە بەڵام هەست و کرداری جوان و ڕوویەکی خۆشی وای هەیە هەزارەها کەس خۆشی دەوێت بەتایبەتی ئێمــەی موسوڵمان سەیری نــاوەرۆکو دەروونی ئادەمیزاد دەکەین نەوەك و ڕوخسار و ڕەنگ و ڕووی ٠٠ بەڵام هەندێ کەس هەر کە لە دایك دەبن هەندێ ئەندامی زیاد یــان دەبێ یا زێدە گۆشتیان هەیە ٠٠٠ بۆی هەیە گــەر ئــەم زێدانە بــە نەشتەرگەری ببڕێن چونکە ئەم زێدە گــۆشتانە دەبنە هۆی ئــازاری دەروونی و لەشی لە ( نیل الاوطار )ی نــەوەوی ئەمەی بە حــەرام دانەناوە ][1] ٠

دووەم :ــ خۆ جوان کردن بە بۆیە :ــ

خۆ جوان کردن بە بۆیە و دەرمانی خۆ سوور و سپی کردن ئەمە بۆ خۆیەتی و هیچی تیا نی‌یە ٠٠٠ هەر چەندە گۆڕینی ڕەنگی تایبەتی

---

(١) نیل الاوطار : النووی ل١٩٢ ج٦

خۆیەتی ••• بەڵام نابێتــە هــۆی گۆڕینی ئەندامی لەشی ڕاستەقینــە هەروەها دەرمانی دەم و چاو شتێکی وەختیە و هەر کاتێ لە ناو چوو ئافرەتەکە دەگەڕێتەوە سەر ڕەنگی ڕاستەقینەی خۆی ••• [ هەروەکو خاوەنی ( نیل الاوطار ) دەڵی هــەر شتێك یــا دەرمانێك وەختی بــێ وەکو (کل) و ( خەنە ) قەدەغە نی‌یە ، هەروەکو ( مالك ) قەدەغــەی نەکردووە ][1] •

## خۆ جوان کردنی ئافرەت تەنها بۆ مێردەکەیەتی

وەکو زانیمان کەوا مێرد دەبێ خۆی بۆ ژنەکەی کۆك و ڕێك بکات هەر واش ئەو جوانی‌یەی کەوا ئیسلام بۆ ئافرەتی نەخشاندووە تەنها بۆ ئەوەیە کــەوا مێردەکــەی ئەوی بەلاوە جــوان بێت و دڵی مێردەکەی بۆ خۆی ڕابکێشێت و بە جۆری کەوا مێردەکەی ژنەکەی لە هەموو ژنانی بێگانەی تر بەلاوە جوانتر بێت•••ئەمەش جوانترین و بەرزترین مانای جوانی‌یە ئیسلام بە هیچ جۆرێك ڕێگەی ئافرەت نادات بۆ کۆڵان و بازار و شەقامەکان یا بۆ بەردەمی پیاوان وەکو پێشەنگایەك خۆی بڕازێنێتەوە •

(١) نیل الاوطار النووی ل١٩٣ ج٦ •

## ( سوپاس )


● بۆ خوشکه « ئیلهام خوشناو » کـه نووسینەوەی ئەو کتێبـەی گرتە ئەستۆ •

● بۆ کاك ( فوزی صالح طاهـر ) کـه بۆ ڕاست کـردنەوەی پرۆڤەکانی ئەو کتێبە یارمەتیەکی زۆری دام •

● بۆ بەڕێزان ( جـودت کاکل دزەیـی ) و ( اسماعیـل صالـح خۆشناو ) و ( بکر سید غەریب بەرزنجی ) و ( قوتابی دلشاد عبدالرحمن ڕەواندوزی ) و بۆ هەموو ئەوانەی هانیـان دام بۆ چاپ کردنی ئەم کتێبە •

ع•ص•ك

# ناوەرۆك

لاپەرە

لاپەڕە

بسم الله الرحمن الرحيم

« ولا تتمنوا مافضل الله به بعضكم على بعض للرجال نصيب مما كسبوا وللنساء نصيب مما اكتسبن » .

سورة النساء ٣٢

# المـرأة

# فى المجتمـع الاسلامـي

علي صالح كـريم

السعر ١٢٥٠ فلسا

رقم الايداع ١٦٤٨ فى المكتبة الوطنية ببغداد لسنة ١٩٨٤

مطبعة شفيق ـ بغداد